# فێربوونی زانستی

# تجويد

أقسامُ اللِّسان




الأسنان ( ٣٢ )



أقسامُ الحَنَكِ الأعلى




المخارجُ الرَّئيسةُ للحروفِ العَربيَّة




ئامادەکردنی

**کتێبخانەی محوی**


چاپی چوارەم - هەولێر

١٤٣١ك - ٢٠١١ز



ابو على الكردى

منتدى اقرأ الثقافى

# علم التجويد




ژمارەی سپاردنی لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان (١٤٩٨) ساڵی ٢٠١٠ ی دراوەتێ

# فێربوونی زانستی تجوید

ئامادەکردنی
کتێبخانەی محوی


چاپی یەکەم
١٤٣١ك - ٢٠١٠ ز

چاپی دووەم
١٤٣١ك - ٢٠١٠ ز

هەولێر
چاپی سێیەم
١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

ناوی کتێب: فێربوونی زانستی تجوید
بابەت : زانستی قورئان
ئامادەکار : کتێبخانەی محوی
نەخشەسازی : کۆمپیوتەری ( هیـــوا )
تیراژ: ٢٠٠٠٠ دانە
چاپ: یەکەم / ٢٠١٠ - چاپی دووەم ٢٠١٠
چاپخانە :

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٤٩٨)ی
ساڵی(٢٠١٠)ی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إنّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا، من يهده الله فلا مُضلّ لهُ ومن يُضلل فلا هادي له، واشهد ان لا إله إلا الله وحدهُ لا شريك لهُ، واشهد ان محمداً عبدهُ ورسولهُ...

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (آل عمران:١٠٢)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (النساء:١)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ۝ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ ( الأحزاب: ٧٠-٧١)

اما بعد..... فانّ أصدق الحديث كتابُ الله، وخير الهدى هدى (محمد) (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكُل ضلالة في النار.

ئەم نوسراوە بریتییە لە دوو بابەت، یەکەمییان باسی تجویدی قورئانە، دووەمییان کۆمەڵێ بابەتی جۆراو و جۆرە لە بارەی قورئانەوە، پێنج چەند ساڵێك لەمەوبەر تەجویدێکم نووسی، بەڵام ئەوکاتە چاپ نەکرا بەڵکو تەنها (استنساخ) دەکرا، بەڵام لەم دواییەدا پێم باش بوو چاوێکی پێدابخشێنمەوەو هەندێ دەستکاری بکەمو چەند بابەتێکی تریشی بۆ زیاد بکەم، پێم وایە تەجویدەکە زۆر زۆر درێژ نییە وەکورتیش نییە.

لەپاشان پێم باش بوو بابەتێکی تریش بەناوی (کۆمەڵێ زانیاری دەربارەی قورئان) لەگەڵ تەجویدەکە بتووسم ئەمەش بۆ زیاتر شارەزا بوون لەقورئان.

وەهەروەها کۆمەڵێك وێنەم لە (اطلس التجوید)ی (ابو ایمن)م گواستۆتەوە بۆ بەشی (مخارج الحروف) و (صفات الحروف) ی ئەم کتابە.

داواکارم لە خوای گەورە ئەم نوسراوەم لەبەر ئەو بێت، وە بیکاتە مایەی کۆکردنەوەی زەخیرەیەکی زۆر بۆ خۆم و بۆ ئەوانەش کە سوودی لێ وەردەگرن.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعه بإحسان الى يوم الدين.

# مانای چەند وشەیەك

| | |
|---|---|
| کلمة | ووشە |
| حرْف | پیت |
| فَتحة | سەر |
| كَسْرَة | ژێر |
| ضَمّة | بۆر |
| سكون | زەنە |
| غُنّة | مینگە |
| مُتَحرِّك | بزواو، حەرەکەدار |
| ساكِن | زەنەدار، سکون دار |

## پێناسەی تەجوید ( تعريف التجويد )

تەجوید لە زمانەوانیدا واتە (تحسين) یانی: جوانکردن چاك کردن (جَوَّد يُجوِّدُ تجويداً) دەڵێ (جَوَّد الشئ)، یانی شتەکەی جوان کرد شتەکەی چاك کرد (أجاد الشئ) شتەکەی بەباشی ئەنجام دا.

*بەڵام (تجويد) لە زاراوەدا (إصْطِلاحِ القُرّاءِ) بەم شێوە هاتووە:*

(اعطاء كل حرف حَقَّهُ[1] و مستحَقَّهُ[2] من مخرج وصفة وغنة ومد وترقيق وتفخيم) واتە: بریتییە لە دانی ماف هەموو پیتێك لە سیفاتی خۆیی و لاوەکی لە شوێنی دەرچوون و سیفەت و مینگە و درێژکردنەوە و لاوازکردن و قەڵەو کردن.

تجوید زانایان چەند پێناسەیەکییان بۆ کردووە جا بە کورتی دەتوانین بڵێین، ئەو زانیارییە کە فێری چاك خوێندنەوەی قورئانمان دەکات بەوشێوەی کە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستراوە.

---

(١) حقّه: أخراجه من مخرجه وأعطاؤه صفاته اللازمة مثل الهمس والاستعلاء.

واتە: دەرچوونی پیتەکە لە شوێنی دەرچوونی خۆی وە پێدانی سیفەتە بنەڕەتییەکانی وەك شاردنەوە (همس) وە بەرزبوونەوە (استعلاء)، کە ئەم دووە لەم (صفات الحروف) باسییان کراوە.

(٢) ومستحقه: هو أعطاؤه صفاته العارضة كالتفخيم والادغام والغنّة.

واتە: ئەمە بریتییە لە پێدانی ئەو سیفەتانەی کە تووشی دێت وەك گەورەکردن و تێکهەڵکێشان و مینگە، واتە سیفاتی لاوەکی و زیادە ئەو سیفەتەی کە بۆی دروست دەبێت.

## مەبەست و ئامانج چییە لە زانستی تجوید (غایه التجّوید)

مەبەست و ئامانج لە زانستی تەجوید بریتییە لە پاراستنی زمان لە هەڵەکردن لە خوێندنی قورئان.

## حوکمی خوێندنەوەی قورئان بە تەجوید چییە؟

خوێندنی قورئان بە تەجوید فەرزی (عین)ە لەسەر هەموو قورئان خوێنێك جا چ پیاو بێت چ ئافرەت ابن الجزری دەڵێ:

والأخْذُ بِالتّجوِيدِ حَتْمٌ لازِمٌ مَنْ لمْ يُجوِّد القُرآنَ آثمٌ

لأنهُ بهِ الإلهُ أنْزَلا وهكذا منهُ إلينا وصَلا

وهو ايضاً حِليةُ التلاوةِ وزينةُ الأداءِ والقراءَةِ

وهو إعطاءُ الحروفِ حَقَّها مِنْ صفةٍ لها ومستحَقها

## حوکمی فێربوونی زانستی تجوید چییە؟

فێربوونی زانستی تجوید فەرزی کفایە یە

### ژمارەی پیتەکانی زمانی عەرەبی:

پیتەکانی زمانی عەرەبی (٢٨) پیتن کە ئەمانەن:

((ا، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن، هـ، و، ي)).

### ناوەکانیان بەم شێوەیە

((ألف، با، تا، ثا، جيم، حا، خا، دال، ذال، را، زايْ، سين، شين، صاد، ضاد، طا، ظا، عين، غين، فا، قاف، كاف، لام، ميم، نون، ها، واو، يا))

وە هەندێك لە زانایان دەڵێن پیتەکانی زمانی عەرەبی (٢٩) پیتە چونکە ئەوان (همزە) و (ألف)یان لێك جیاکردۆتەوە

دەڵێن:

١-(همزە) پیتێکی تەواو (صحیح)ە هەموو بزواوەکان وەردەگرێت

(ءَ، ا، إ، أ، آ، آ)

ب-(ألف) پیتێکی زەنەدارە و بزواو وەرناگرێ و لە بنەڕەتیشدا یان (واو) بووە یان (یا) بووە.

## قورئان سێ جار دابەزێنراوە

یەکەم: لەلایەن خواوە بۆ (لوح المحفوظ)

دووەم: لە (لوح المحفوظ) بۆ (بیت العزة) لە ئاسمانی دونیادا.

سێیەم: لە (بیت العزة) بەهۆی (جبریل) دابەزێنراوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) بەش بەش.

## پێغەمبەر (ﷺ) چۆن قورئانی گەیاندووە

پێغەمبەر (ﷺ) بە دوو ڕێگا قورئانی بە ئێمە گەیاندووە:

١-(مكتوباً) بە نووسین، کاتێك کە بە شێك لە قورئان دابەزیوە پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمانی بە نووسەرانی سروش (وحی) کردووە کە بینووسنەوە تا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ)، وەفاتی کردووە هەموو قورئان نووسرابۆوە.

٢-(منطوقاً) بە خوێندنەوەی بەسەر ئەسحابەکاندا، ئەوانیش گواستییانەوە بۆ دوای خۆییان.

جا ئەم جۆرە گواستنەوەیە بە دەنگ (النقل الصوتی) بە (تواتر)[1] بە ئێمە گەیشتووە.

---

(١) (تواتر) ئەوەیە کە چینێکی زۆر دەنگ و باسێك بگێڕنەوە لە چینێکی زۆری تر چین لە دوای چین لە یەکەم سەنەدی تا کۆتا سەنەدی، بەشێوەیەك کە عەقل نەتوانێ بڵێ ئەمانە هەمووی درۆن.

## حوکمی ( إستعاذة ) و ( بَسمَلَة )

یەکەم: الإستعاذة-واتە: خۆ پاراستن، یەکێك لە شێوەکانی (إستعاذة) بەم جۆرەیە (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)[1] سوننەتە بۆ قورئان خوێن کە دەست بە قورئان خوێندن دەکات لە سەرەتای سورەت بوو یا لە سەرەتاکەی نەبوو بیخوێنێ، وە گوتراویشە (إستعاذة) لە کاتی دەستپێکردنی خوێندنەوەی قورئان واجبە بە بەڵگەی ئایەتی ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ (النحل: ٩٨).

واتە: هەر کاتێك کە قورئانت خوێند خۆت بپارێزە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو و دوورخراو لە رەحمەتی خوا.

خیلافیش لەوەدا نییە کە (إستعاذة) بەشێك نییە لە قورئان.

وە لە سورەتی (توبة) ئەگەر لە یەکەم جار دەستت بە خوێندنەوەی کرد ئەوە تەنها (إستعاذة) دەڵێی.

وە ئەگەر قورئانت دەخوێند شتێك هاتە پێشت قورئانەکەی لێ پچڕاندی ئەگەر شتەکە بێگانە نەبوو وەك پشمین و کۆخە ئەوە (إستعاذة) دووبارە ناکەیتەوە، بەڵام ئەگەر شتەکە بێگانە بوو ئەو کاتە (إستعاذة) دووبارە دەکەیتەوە.

دووەم: (البَسْمَلَةُ) واتە (بسم الله الرحمن الرحیم)

(بسم الله الرحمن الرحیم) ناکۆکی لەوەدا نییە کە بەشە ئایەتەکە لە سورەتی (نمل)، وە لە مەزهەبی (حفص عن عاصم)دا (بسم الله الرحمن الرحیم) ئایەتەکە لە سورەتی (فاتحة) و وە لە هەموو سورەتەکانی قورئان تەنها سورەتی (توبە) نەبێت.

(١) واتە: خۆم دەپارێزم بە خوا لە شەیتانی دوورخرا و لە رەحمەتی خوا.

جـا گـوتنی (بـسم الله الـرحمن الـرحیم) سـوننەتێکی موئەککەدەیـە لـە سەرەتایی هەموو سووڕەتێك تەنها سوڕەتی (توبة) نەبێت.
بـەڵام ئەگـەر لـە سـەرەتای سـووڕەت دەسـت بـە خوێندنـەوە نـەکرا ئـەوە قورئـان خـوێن دەتـوانی بیخـوێنی وە دەشـتوانیْ نـەیخوێنی، وە هـەروەها جائزیشە لە ناوەندەکانی سوڕەتی (توبة) (بسملة) بڵێی.

## خوێندنی ( إستعاذة ) و ( بسملة ) و سووڕەت

ئەگەر قورئانخوێن (إستعاذة) و (بسملة) و سووڕەتی خوێند ئەوە چوار باری بۆ هەیە کە ئەمانەن:
١-پچڕاندنی هەموویان.
ئەمەیان لە هەموویان باشترە، واتە بڵێی (أعوذ بـالله من الشیطان الرجیم) بوەستی ئینجا بڵێی (بسم الله الـرحمن الـرحیم) بوەستی ئینجا دەست بکەی بە خوێندنی سووڕەتەکە.
٢-گەیاندنی ناوی خوا بە سووڕەت بەس.
واتە: بڵێی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) رابوەستی ئەوجا بڵێی (بسم الله الرحمن الرحیم) بەبێ وەستان سووڕەتەکەی لەگەڵ بخوێنی.
٣-گەیاندنی خۆپاراستن (إستعاذة) بە (بسملة) و بوەستی ئینجا دەست بکەی بە خوێندنی سووڕەتەکە.
٤-گەیاندنی هەموویان.

## ناوی خوا لە نێوانی دوو سووڕەت

خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم) لە نێوانی دوو سووڕەتان چوار باری بۆ هەیە کە ئەمانەن:
١-لە سەر هەموویان بوەستی.
ئەمەیان لە هەموویان باشترە، واتـە کـە سووڕەتەکەت تـەواو کـرد بوەستی

ئینجا بڵێی (بسم الله الرحمن الرحیم) دیسان بوەستی ئینجا دەست بکەی بە خوێندنی سوورەتەکەی تر.

٢-هەموویان بگەیەنی.

٣-گەیاندنی (بسملة) بە سوورەتی دووەم.

واتە: کە سوورەتەکەت تەواو کرد بوەستی ئینجا ( بسم الله الرحمن الرحیم) بخوێنی بەبێ وەستان سوورەتەکەی لەگەڵ بخوێنی.

٤-ئەم حاڵەتی چوارەمە جائز نییە کە بەم شێوەیە:

سوورەتەکە تەواو بکەی بەبێ وەستان بیگەیەنی بە (بسمله)ی سوورەتی دووەم بوەستی ئینجا دەست بکەی بە خوێندنی سوورەتی دووەم وەك ئەوە بڵێی ﴿وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ ( بسم الله الرحمن الرحیم) بوەستی ئینجا بڵێی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾.

## چۆنیەتی گەیاندنی سوورەتی ( أنفال ) بە ( توبة )

ئەگەر لە سەرەتادا دەستت کرد بە خوێندنەوەی سوورەتی (توبة) ئەوە تەنها (إستعاذة) دەخوێنی، بەڵام ئەگەر سوورەتی (أنفال)ت تەواو کرد ویستت راستەوخۆ (توبە)ش بخوێنی ئەوە سێ باری بۆ هەیە.

أ-گەیاندنی کۆتایی سوورەتی (أنفال) بە (توبة) بەبێ سەکتە[1] و هەناسە.

ب-سکتەیەك کردن بە قەد دوو حەرەکە بەبێ هەناسە لە نێوانی هەردوو سوورەت.

ج-راوەستان بە هەناسە لە نێوان هەردوو سورەت.

---

(١) (سکتە) وەستانێکە بە قەد دوو حەرەکە بەبێ هەناسە، دوو حەرەکە: فەتحە یەك حەرەکەیە، کسرە، ضمّة: یەك حەرەکەن. کەواتە دوو حەرەکە بە قەد گوتنی (واو)ێکە.

## أللّحن (الخطأ) في تلاوة القرآن

دووجۆرە هەڵە (لَحْن) هەن لە خوێندنی قورئان

**١-اللحنُ الجَليّ- هەڵەی ئاشکرا:**

ئەمە بریتییە لە هەڵە کردن لە خوێندنەوەی پێکهاتەی وشەکە جا کاریگەری هەبێت بۆ سەر ماناکەی یان نەیبێت، ئەمەش بۆیە پێی دەوترێت هەڵەی ئاشکرا چونکە هەڵەکە ئاشکرایە لای زانا بە ئەحکامی تەجوید و نەزان پێی.

نموونە لەسەر ئەوەی کە هەڵەکە کاریگەری هەبێت لەسەر ماناکەی وەك ئەوە فەتحەی تای (انعمت) بکەی بە بۆر (ضمة).

نموونە لەسەر ئەوەی کە هەڵەکە کاریگەری نەبێت بۆ سەر ماناکەی وەك ئەوە ژێری های (الحمد للهِ) بکەی بە بۆر.

جا بە کۆی دەنگ (إجماع) هەڵەی ئاشکرا (اللحن الجلي) حرامە.

**٢- اللحن الخفيّ- هەڵەی شاراوە:** ئەمە بۆیە پێی دەوترێت هەڵەی شاراوە چونکە تەنها لای ئەوانە روونە کە شارەزان لە ئەحکامی تەجوید، شاراوەیە لەخەڵکی تر، ئەم جۆرە هەڵەیەش بۆ نموونە بریتییە لە تەرك کردنی (ادغام) یا (إخفاء) یا (مد) یا (غنة) ئەم جۆرە هەڵەیەش (مکروه)ە وە گوتراویشە حەرامە.

## جۆرەكانی خوێندنەوە

سێ جۆر خوێندنەوە هەن كە ئەمانەن:

١-الترتيل[1] : ئەم جۆرە خوێندنەوە باشترین جۆری خوێندنەوەی قورئانە، ئەمەش بریتییە لە خوێندنی قورئان بە لەسەر مانەوە و تێگەیشتن و پەلە نەكردن خوا دەفەرمووێ: ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً﴾ (المزمل: ٤)

واتە: وە دەوری قورئان بكەرەوە بە لەسەرخۆیی ( بەرێك و پێكی).

٢-الحدر: ئەمەش بریتییە لە خوێندنەوەی قورئان بە پەلە، بەلام لەم جۆرە خوێندنەوەیەش پێویستە ئەحكامەكانی تەجوید بە تەواوی جێبەجێ بكرێ.

٣-التدوير: ئەم جۆرە خوێندنەوەش مام ناوەندیە دەكەوێتە نێوانی (ترتيل) و (حدر).

تێبینی : هەر وەكو گوتمان (ترتيل) باشترین جۆری خوێندنەوەیە، چونكە زیاتر یارمەتیت دەدا بۆ تێگەیشتن لە قورئان و وردبوونەوە تێیدا.

جا ئەم سێ جۆرە خوێندنەوەیە بە كامییان بخوێنی جائزە.

(١) الترتيل: وهو في اللغة مصدر رَتَّلَ الكلام: إذا أحسن تأليفه، و في الاصطلاح: قراءة القرآن الكريم على مكث وتفهم من غير عجلة.

# مَخَارِجُ الْحُرُوْفِ ( شوێنی دەرچوونی پیتەکان )

شوێنی دەرچوونی پیتەکان (١٧) [1] . شوێنن، ئەم حەڤدە شوێنەش دابەش دەبن بۆ سەر پێنج شوێنی سەرەکی کە ئەمانەن:

١-الجوف (بۆشایی ناو دەم و قورگ).

٢-الحلق ( گەروو).

٣-اللسان (زمان).

٤-الشفتان ( دوو لێوەکان).

٥-الخیشوم (کۆتایی کونە کەپوو سەر قورگ).

جا ئەگەر بمانەوێ شوێنی دەرچوونی پیتێك بزانین ئەوە پیتەکە سکوندار یا شەددەدار دەکەین هەمزەیەکی لە پێش دادەنێین جا دەنگ لە کوێ تەواو بوو ئەو شوێنە شوێنی دەرچوونی پیتەکەیە وەك (اَبْ، اَبّ ، اَقْ، اَقّ ، اَمْ، اَمّ ).

هەموو پیتەکان شوێنی دەرچوونییان دەتوانرێ بە تەواوی بزانرێ تەنها ئەو پیتانە نەبن کە لە (جوف) دەردەچن واتە پیتەکانی (مد) کە ئەمانەن (ـَ اْ، ـُ وْ، ـِ يْ ) ئەم پیتانە ناتوارێ شوێنی دەرچوونییان لە (جوف) دیاری بکرێ.

***گوتمان لە پێنج جێگاو شوێنی سەرەکی پیتەکان دەردەچن کە ئەمانەن:***

**١-الجوف:** بۆشایی دەم و قورگ (الخلاء الداخل في الفم والحلق)

ئەم مەخرەجە سێ پیتی لێ دەردەچێ کە پیتەکانی درێژکردنەوەن (حروف المد) (ـَا ،ـُو، ـِي ).

---

(١) (مخارج الحروف) حەڤدە شوێنن کە ئەمە قەولی راجحە، ئەمە قسەی ابن الجزری و (خلیل) ی کوڕی أحمد و زۆربەی نەحوییەکانە.

## ٢-الحلق: گەروو

گەروو سێ شوێن دەرچوون (مخرج)ی هەیە کە شەش پیتی لێ دەردەچێ (ء، هـ، ع، ح، غ، خ) کە ئەم شەش پیتە، پیتەکانی حەلقیان پێ دەوترێ

ئەوپەڕی گەروو واتە ئەو بەشەی کە لە دوای سینگ دێت پیتی (ء ، هـ) ی لێ دەردەچێ بەڵام هەمزەکە شوێنەکەی قوڵترە.

ناوەندی گەروو پیتی (ع، ح)ی لێ دەردەچێ بەڵام (ع) لە خوارترە،

نزیکترینی گەروو کە دەکەوێتە لای دەم پیتی (غ، خ) ی لێ دەردەچێ بەڵام (غ) لە خوارترە.

بەم شێوەی کە لەم وێنەدا دەبینرێ.



## ٣-اللسان (زمان) (١٠) دە مەخرەجی هەیە:

پێم باشە پێش ئەوەی باس لە مەخرەجی زمان بکەین باسێك لە ددانەکان و بەشەکانی زمان بکەین، ئەو کەسانەی کە (٣٢) ددانییان هەیە بەم شێوەیە:

١-اربع ثنایا (برندەکان) چوار ددانن لە پێشەوەی دەم و دوو لەسەروو دوو لە خواروو کارییان پچڕاندن (قطع)ی خۆراکە.

٢-اربع رباعیّات (ئەقڵ ددانەکان) ئەمەش چوار ددانن دوو لەسەروو دوو لە خواروو دەکەونە ئەم لا و ئەو لای (الثنایا) کارییان پچڕاندنی خۆراکە یارمەتی (ثنایا) دەدەن.

٣-اربع أنیاب: ئەمانەش چوار ددانن لە دوای (رباعیّات) دێت دوو لە سەروو دوو لە خواروو، سەریان تیژە ئەمانە هەڵدەستن بە پچڕاندنی گۆشت لە کاتی نان خواردن.

٤-الأضراس: ئەمانە (٢٠) ددانن لە دوای (أنیاب) دێن (١٠) لە لای سەروو پێنج لەلای راست پێنج لەلای چەپ وە (١٠)ی تر لەلای خواروو پێنج لەلای راست و پێنجیش لەلای چەپ، ئەمانە سەریان پانە رەگێکی بەهێزییان هەیە، کاریان هاڕینی خواردنە، ئەم بیست ددانە دابەش دەبن بۆ سێ بەش:

أ-اربع ضواحك: ئەمانە لە دوای (أنیاب) دێن چوار ددانن دوو لە سەروو لەم لاو لەولا دوو لە خواروو هەریەکە و لەلایەك ئەمانە بۆیە پێیان دەوترێ (ضواحك) لە کاتی زەردەخە بەدیار دەکەون.

ب-الطواحن: ئەمانە ژمارەیان دوازدە ددانە شەشیان دەکەوێتە لای سەروو سێ لەلای چەپ سێ لەلای راست و شەشییان دەکەوێتە لای خواروو سێ لای چەپ و سێ لەلای راست.

ج-اربعة نواجذ: چوار (نواجذ) دەکەونە کۆتایی ددانەکان، دوو لە سەروو لای راست و لای چەپ دوو لە خواروو لای راست و لای چەپ، بەڵام ئەم چوار ددانە هیچ دەورێکییان نییە لە دەرچوونی هیچ پیتێك.

وەك لەم وێنەدا دەردەكەوێ:




# أقسام اللسان

## بەشەكانی زمان.



## مەخرەجەکانی زمان

١-ئەوپەڕی زمان (اقصى اللسان) واتە کۆتایی زمان لەگەڵ مەڵاشوو یان ئاسمانەی سەرووی دەم لە بەرامبەری شوێنی دەرچوونی پیتی (ق)ە ئاسمانەی سەرووی دەم مەڵاشوو لە دوو بەش پێک هاتووە بەشی پێشەوەی ئێسک و رەقە، بەشی دواوەی گۆشت و نەرمە جا شوێنی دەرچوونی (قاف) کۆتایی زمانە لەگەڵ بەرامبەری لە بەشە نەرمەکەی ئاسمانەی سەرووی دەم

وەك لەم وێنەدا بەدەردەکەوێ.



٢- ئەوپەڕی زمان کەمەك لە دوای مەخرەجی (ق) واتە کەمەك بۆ لای دەم دێ لەگەڵ بەرامبەری لە مەڵاشوو ئاسمانەی سەرووی دەم مەخرەجی پیتی (ك)ە (مەڵاشوو لە مەخرەجی (ك) هەندێك لە بەشە نەرمەکە و هەندێك لە بەشە رەقەکەی بەردەکەوێ، وەك لەم وێنەدا دەبینرێ




٣-ناوەندی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم شوێنی دەرچوونی سێ پیتە (ی، ش، ج) بە مەرجێك پیتی (یا)ەکە مەددی نەبێت،

لەکاتی دەرچوونی (ی) زمان بەرز دەبێتەوە بەڵام ناگاتە ئاسمانەی سەرووی دەم، وە لە کاتی دەرچوونی (ش) زمان زیاتر بەرز دەبێتەوە، بەڵام ناگاتە مەڵاشوو، بەڵام لەکاتی دەرچوونی پیتی (ج) ناوەندی زمان دەنووسێ بە بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم.

تێبینی: پیتی (ج) لە زمانی عەرەبی وەکو (گ)ی (گیا-گیان)ی کوردی دەخوێنرێتەوە، کەواتە پیتی (ج) لەزمانی عەرەبی وەکو (ج)ی کوردی ناخوێنرێتەوە.

وەك لەم سێ وێنەدا دەبینرێ



٤- بەلێدان و پاڵەپەستۆی یەکێك لە لا تەنیشتەکانی زمان بەلای چەپی یا لای راستی خرێکانی[1] لای سەروو شوێنی دەرچوونی پیتی (ض)ە، یا بە لێدان و پاڵەپەستۆی هەردوو لا تەنیشتی زمان لە یەك کاتدا لە هەردوو لای خرێکانی لای سەروو بەم شێوەش پیتی (ض) دەردەچێ.
کەواتە پیتی (ض) دەتوانی بە سێ رێگا دەری بچوێنی.
وە دەڵێن پیتی (ض) (خروجه من الحافة اليسرى اسهل واكثر)
واتە: دەرچوونی پیتی (ض) بە لاتەنیشتی چەپی زمان لەگەڵ خرێکانی سەرووی لای چەپ ئاسانترە و زیاتریش بەکاردێت.

وەك لەم وێنەدا دەبینرێ.




---

(١) خرێکان: شازدە ددانن دەکەونە کۆتایی ددانەکان لەلای سەروو: چوار لەلای راست چوار لەلای چەپ لە خوارووش: چوار لەلای راست چوار لەلای چەپ بە مەرجێ چوار ددانی کۆتایی لێ دەربکەی واتە (نواجذ)ەکان وەك گوتمان (نواجذ) ەکان هیچ رۆڵێك نابینن لە دەرچوونی هیچ پیتێك.

٥-قەراخی پێشەوەی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە مەڵاشوو یانی ئاسمانی سەرووی دەم لە ئاستی ددانەکانی( ثنایا ورباعیات و أنیاب و ضواحك) جا لەلای راستی سەرەوە یا لەلای چەپی سەرەوە شوێنی دەرچوونی پیتی (ل)ە.

بەڵام پیتی (ل) بە پێچەوانەی پیتی (ض) ئاسانترە بە لای راست دەربیبکەی‌و زیاتریش لای راست بەکار دێت.

وەك ئەم وێنەیە.






٦-پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ پدوی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە (الثنايا العليا) شوێنی دەرچوونی پیتی (ن)ە.
(من طرف اللسان و ما يحاذيه من لثة الثنايا العليا وهو مخرج النون (ن).

وەك ئەم وێنەیە



٧–پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ بەرامبەری لە پدوی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە شوێنی دەرچوونی پیتی (ر)، بەلام ئەمە لەمەخرەجی (ن) زیاتر بۆ لای پشتی زمان دەڕوات (المخرج السابع: من مخرج النون إلاّ أنَّهُ اقربُ (اي أدخل) إلى ظهر اللسان ويخرج منه الرّاء)[1].

٨–پێشەوەی زمان (طرف اللسان)[2] لەگەڵ رەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوە شوێنی دەرچوونی سێ پیتە (ت، د، ط)

(رەگی ددان مەبەستمان ئەو شوێنەیە کە ددان و پدو پێك دەگەن)، جا ئەگەر پێشەوەی زمانت بە نەرمی لە رەگی دوو ددانی لای سەرەوە بدەی پیتی (ت) دەردەچێ، بەهێزتر لێ بدەی (د) دەردەچێ، ئەگەر زمانت بەرزبکەیەوە پێشەکەی لە رەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوەی بدەی (ط) دەردەچێ.

(طرف اللسان وأُصول الثنايا العليا ويخرج منه (د، ت، ط)

وەك ئەم دوو وێنەیە







---

(١) (الفرّاء) يرى أن مخرج (اللام والنون والرّاء) واحد وهو طرف اللسان مع إلتصاقه بأصول (الثنيتين) و بالتأمل نلحظ أن هذه الأحرف قريبة قرباً شديداً في الخارج.

(٢) بۆ زانینی (طرف اللسان) بگەڕێوە دواوە بۆ بەشەکانی زمان (أقسام اللسان).

٩- پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ نێوانی ددانەکانی سەرەوەو خوارەوە نزیک بە ئی خوارەوە لەگەڵ کەلێنێکی کەم لە نێوانییان مەخرەجی (ز، س، ص)ە (طرف اللسان مع ما بين الاسنان العليا و السفلى قريبة إلى السفلى مع فُرجةٍ قليلةٍ بينهما مَخرج (الزاى والسين والصاد)

يا بەم شێوە (مِنْ بَينِ طَرفِ اللسان ومن بينِ الثنايا العليا والسفلى مع انفراج ما بين الفكّين ويخرجُ منه (السين والصاد والزاي).

وەك ئەم دوو وێنەیە



١٠-پێشەوەی زمان (طرف اللسان) و سەری دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە (الثنايا العليا) شوێنی دەرچوونی ئەم سێ پیتەیە (ث، ذ، ظ) لە کاتی دەرچوونی (ث، ذ) زمان بەرز ناکرێتەوە، بەڵام لە کاتی دەرچوونی (ظ) زمان بەرز دەکرێتەوە.

(ظهر طرف اللسان وأطراف الثنايا العيا، ويخرج منه (الثاء والذال و الظاء) وتسمى الأحرف اللثوية لقربها الشديد من لثة الثنايا العليا) لە کاتی دەرچوونی ئەم سێ پیتە زمان کەمۆکەك دێتە دەرەوە لە نێوان ددانەکان.

وەك ئەم دوو وێنە



### ٤- دوو لێوەكان (الشفتان) دوو شوێن دەرچوونی هەیە:

١-ناوەوەی لێوی خوارەوە لەگەڵ سەری دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە (الثنايا العليا) پێكەوە دەنووسرێنرێن بەڵام زۆر بە توندی پێكەوە نانوسێندرێن بە شێوەیەك بێت ماوەی ڕۆیشتنی هەوای هەبێت شوێنی دەرچوونی پیتی (ف)ە

وەك ئەم وێنەیە.



٢-نێوانی دوو لێوەکان سێ پیتی لێ دەردەچێ (و، م، ب) بە مەرجێك (و) واوی مەدی نەبێت (ـُ وْ)

جا دوو لێوەکـان لـەکاتی دەرچوونی (و) کـەمێك دەکرێتـەوە بەشـێوەی کەوانـەیی و ئەوپـەڕی زمانیش بـەرز دەبێتـەوە، بەڵام لـەکاتی دەرچوونی (م، ب) پێکـەوە دەنووسـێن، لـەکاتی دەرچـوونی (ب) تونـدتر پێکـەوە دەنووسرێن لە (م) وە لەکاتی دەرچوونی (م) غوننەی لەگەڵدا دەبێت.

وەك ئەم وێنانە









٥- الخيشوم: بەرزترین بەشی کەپوو یا ئەوپەڕی کەپوو لە ژوورەوە (أعلى الأنـف) أو (أقـصى الأنـف) یـا بلـێین (خیـشوم)، مینگـە (الغنـة) لێـوە دەردەچێت.

## الغنة:

هـي صـوت يخـرج مـن التجويـف الأنفـي (الخيـشوم) ويـصاحب في اللغـة العربية حرفي النون والميم مهما كان وضعها ويختلف طول زمنه بإختلاف الحكم[1].

واتە: (غنە) بریتییە لە دەنگێك دەردەچێ لە بۆشایی کەپوو (الخشیوم) (غونە)ش لە زمانی عەرەبی لەگەڵ نون و میم دەردەچێ جا نون و میمە کە هەرچۆنێك بن وە بەپێی حوکم درێژی کاتی (غونە) دەگۆڕێ.

وەك ئەم دوو وێنەیە




(١) أطلس التجويد.

## پلەکانی هێزی (غوننە)

پلەی یەکەم: غوننە لە نون و میمی شەددەدار وە لە نون و میمی دەغم کراو لە ئەوپەڕی تەواوی دایە.

پلەی دووەم: غوننە لە کاتی (إخفاء) کردنی نون و میم کامل و تەواوە.

پلەی سێیەم: غوننە لەکاتی ئاشکرا کردن (إظهار)ی نون و میمی سکوندار (ناقصة) و ناتەواوە.

پلەی چوارەم: غوننە لە نون و میمی حەرەکەداردا کەمترین بەشی هەیە.

# سیفەتی پیتەکان ( صفات الحروف )

هەموو پیتێك لە زمانی عەرەبیدا چەند سیفەتێکی هەیە، جا زانایان حەڤدە سیفەتییان بۆ پیتەکان باس کردووە، دەیان دژی یەکترن، حەوتیشییان دژ (ضد) یان نییە.

**یەکەم:**

ئەم پیتانەی کە دژ (ضد) یان هەیە ئەمانەن:

١-الجهر دژەکەی الهمس.

٢-الشدّة دژەکەی الرّخاوة و بینهما التوسط.

٣-الإستعلاء دژەکەی الإستفال.

٤-الإطباق دژەکەی الإنفتاح.

٥-الإذلاق دژەکەی الإصمات

**دووەم:**

ئەم پیتانەی کە دژ (ضد) یان نییە ئەمانەن:

١-الصفیر.

٢-القلقلة.

٣-اللین.

٤-الإنحراف.

٥-التکریر.

٦-التفشي.

٧-الإستطالة.

**یەکەم: ئەم پیتانەی کە دژ ( ضد )یان هەیە :**

**١-أ- الجهر: ئاشکرا**

بریتییە لە گیرانی نەفەس هەناسە لە کاتی دەربڕینی پیتەکانی ئەمەش لەبەر بە هێزی پشت بەستنە بە شوێنی دەرچوونی پیتەکە یا گوتراوە: پیتەکانی (جهر) بۆیە بەم ناوەناونراون چونکە لەکاتی دەربڕینی ئاشکرا دەکرێت لەبەر هێزی پیتەکە و هێزی پشت بەستن پێیەوە، پیتەکانی (جهر) نۆزدە (١٩) پیتن کە ئەمانەن:

(ا ب ج ذ ر ز ض ط ظ ع غ ق ل م ن و ا د ي)

کە لەم رستە کۆ دەبنەوە (عظم وزن قارئ ذي غص جد طلب)

ب-الهمس: شاردنەوە

(الهمس) ئەو پیتانەن کە لەکاتی دەربڕین دا هەناسەییان لەگەڵ دێت ئەمانەش (١٠)پیتن کە لەم رستەدا کۆ دەبنەوە (فحثە شخصٌ سكت) (ف ح ث هـ ش خ ص س ك ت)

## ٢-ا- الشدة: توندی

ئەو پیتانەن کە لەکاتی دەربڕین دا دەنگی لەگەڵ دەپچڕێ ( قطع) دەبێت لەبەر هێزی پشت بەستن بە شوێنی دەرچوونی پیتەکە، ژمارەی ئەو پیتانەش هەشتن کۆ دەبنەوە لە (أجِدُك قطبت)

(الشدة: إنحباس جريان الصوت نتيجة غلق المخرج)

وەك ئەم دوو وێنەیە



**ب- الرْخاوة: شلی**

ئەم پیتانەن کە لەکاتی دەربڕینییان دەنگی لەگەڵ بەردەوام دەبێت ئەمانەش (١٦) پیتن، واتە جگە لە پیتەکانی (شدة) و ( توسط) (الرخاوة): جریان الصوت عند مروره في المخرج

وەك ئەم دوو وێنەیە






ج-توسط (البينية): پێنج پیتی ترمان هەیە دەکەونە نێوانی (شدة) و (رخاوة) کۆبووینەوە لە (لِنْ عُمَر).

(البينية): هي الجريان الجزئي للصوت في مخرج الحرف بسبب عدم كمال غلقه.

*واتە: (البينية: یا (التوسط) بریتییە لە ڕۆیشتنی بەشێك لە دەنگ لەشوێنی دەرچوونی پیتەکە بەهۆی تەواو دانەخران و قەپات نەبوونی شوێنی دەرچوونەکە.

وەك ئەم وێنانە



### ٣-أ- الإستعلاء: بەرزبوونەوە

* ژمارەی پیتەکانی (الإستعلاء) حەوت پیتن کۆدەبنەوە لە (خصّ ضغطٍ قظ)

(الإستعلاء) سیفەتی ئەم پیتانەیە کە لەکاتی دەربڕیندا کۆتاییەکانی زمان بەرزدەبێتەوە بۆ مەڵاشوو واتە ئاسمانەی سەرووی دەم وەهەروەها دەنگیش بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمانەی سەرووی دەم (یتصعد الصوت عند النطق بها إلى الحنك الأعلى

وەك ئەم وێنەیە




### ب-الأستفال: ئەوی بوونەوە، نزم بوونەوە.

ئەمە بریتییە لەوەی لەکاتی دەربڕینی پیتەکانی دەنگ بۆ ئاسمانەی سەرووی دەم ناڕوات وپیتەکانیشی جگە لەپیتەکانی (استعلاء)ن (لایتصعّد الصوت عند النطق بها إلى الحنك الأعلى).

وەك ئەم وێنەیە




## ٤-١- الأطباق: تەبق بوون:

ئەمەش بریتییە لە گیربوونی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکانی لە نێوان زمان و ئاسمانەی سەرووی دەم، ژمارەی پیتەکانیش چوار پیتن کە ئەمانەن: (ص، ض، ط، ظ)

وەك ئەم وێنەیە



## ب-الإنفتاح: کرانەوە

ئەمەش هەموو پیتەکان دەگرێتەوە بێجگە لە پیتەکانی (الأطباق) کە (٢٥) پیتن لە کاتی دەربڕینییان دا دەنگ گیر (حصر) نابێت لە نێوانی زمان و ئاسمانەی سەرووی دەم

وەك ئەم وێنەیە



القاف

## ٥-ا-الإذلاق: زمان پاراوی و زمان تیژی.

ئەمەش بریتییە لە دەرچوونی پیتەکانی بە سەریعی و بە تیژی وەك ( ل، ر، ن) چونکە لە پێشەوەی زمان دەردەچن، وە وەك (ف، ب، م) چونکە لەلێوەکان دەردەچن.

کەواتە پیتەکانی (اذلاق) شەشن (ل ر ن ف ب م) کە لە (فرمن لب) کۆدەبنەوە.

ب- الاصمات: (المنع) قەدەغە بوون

ئەمەش بۆیە بەم ناوە ناونراوە (قەدەغە بوون) چونکە نابێ ئەگەر چوار پیت یا پێنج پیت لەم پیتانە لە وشەیەك كۆببوونەوە، پیتێك یا زیاتر لە پیتەكانی (اذلاق)ی تێدا نەبێت.

پیتەكانی (إصمات) یش (٢٣) پیتن واتە جگە لەپیتەكانی (اذلاق)، ئەگەر وشەیەكیش چوار پیت یان پێنج پیت بوو یەكێك لە پیتەكانی (اذلاق)ی تیادا نەبوو ئەوە ئەو وشە وشەیەكی بێگانەیە هاتۆتە ناو زمانی عەرەبی وەكو (عسْجَد)

دووەم: ئەو پیتانەی كە دژ(ضد)یان نییە ئەمانەن:

١-الصفير: فیتە/ فیكە، فیكە لێدان

الصفير: هو حدةٌ في صوت الحرف تنشا عن مروره في مجرى ضيقٍ وحروفه ثلاثة (ص، س، ز).

واتە: بریتییە لە بەرزی لە دەنگی پیت ئەوەش لەوە پەیدا دەبێت كە پیتەكە بە شوێنێكی تەنگدا دەڕوات، كە پیتەكانی سێ پیتن (ص، س، ز)

وەك ئەم وێنەیە



### ٢- القلقلة: لەرینەوە/ دەنگدانەوە:

ئەو پیتانـەن کەلـەکاتی دەرچـوونیاندا لەرینـەوە لـەناو دەمدا دروست دەبێت کاتێك کە زەنەدار (ساکن) بن ئەم پیتانەش پێنج پیتن کۆدەبنەوە لە (قُطْبُ جد).

(قلقلە)[1] دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

١- ئەگەر پیتە قەلقەلەکە لەناوەڕاستی وشەدابوو ئەوە قەلقەلەی بچووکی پێ دەوترێ وەك (تقْطعون - يبْخلون - يجْعلون - يدْخلون).

٢- ئەگەر پیتە قەلقەلەکە لەکۆتایی وشەکەدابوو پێشی پیتی مەد نەبوو ئـەوە قەلقەلـەی ناوەنـدی (وسـط)ی پـێ دەوتـرێ وەك ئـەم (٥) ئایەتـە لـە سورەتی (بلد) بە مەرجێك لەکۆتایی ئایەتەکان بوەستێ:

﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ۝١ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ۝٢ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ۝٣ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ۝٤ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ۝٥﴾ (البلد: ١-٥).

٣- ئەگەر پیتە قەلقەلەکە لە کۆتـایی وشـەدابوو وە پێشی پیتی مەد بوو ئەوە قەلقەلـەی گـەورە (کـبری)ی پـێ دەوتـرێ وەك (مجید/ کتـاب/ الـبروج/ الأسـواق/ محـیط) کاتێـك کـە لەسـەریان دەوەسـتێ کۆتاییـان دەکـەی بەسکون، ئەمانە لەهەموویان زیاتر قەلقەلەیان پێ دەکرێ.

### تێبینی لەبەشی (قلقلە)

أ- هەندێ قورئان خوێن لەبەر ئەوە شارەزانین لە (تجوید) کاتێك کە پیتە

---

(١) لەزۆربـەی زۆری کتابـەکانی (تجوید) (قلقلـة) دابـەش کـراوە بـۆ دووبـەش (قلقلـة الصغری) وە (قلقلة الکبری) قەلقەلەی (وسط)یشیان لەگەڵ (قلقلة الکبری) داوە بـەڵام ئەم دابەشکردنەم پێ چاکتربوو.

قەلقەلەکە بکەوێتە کۆتایی وشە لەبڕی ئەوەی بیلەرێنێتەوە دەیکەن بە پیتێکی شەددەدار.

### ٣- اللین: نەرمی و ئاسانی:

ئەمەش بریتییە لەوەی کە پیتی (وْ - یْ) زەنەداربن و پێشیان سەر (فتحە)ی هەبێت ئەگەر وابوو ئەوە بەئاسانی و بەنەرمی دەردەچن لەشوێنی دەرچونیان وەك (خوف - قوم - البیت - قریش).

### ٤- الانحراف: لادان.

الإنحراف: بریتییە لە لادانی دەنگی پیتی (ل، ر) لەکاتی دەربڕینیان.
جا لەکاتی دەربڕینی (ل) دەنگی لام لا دەدا بۆ هەردوو تەنیشتی پێشەوەی زمان لەبەر ئەوەی پێشەوەی زمان ڕێگەی دەنگەکەی گرتووە (یکون انحراف صوت اللام إلی جانبي طرفي اللسان لاعتراض الطرف طریق اللام).
بەڵام پیتی (را) بەپێچەوانەوە دەنگ لەهەردوولای تەنیشتی پێشەوەی زمان لادەدا بۆ ناوەوەندی (أما الراء فبالعکس، ینحرف الصوت بها من جانبي طرف اللسان إلی وسطه)

### ٥-التکریر: (دووبارە)

ئەمە سیفەتی پیتی (را)یە چونکە پێشەوەی زمان لەکاتی دەربڕینی ئەم پیتە دووجار یا سێ جار لە پدو دەدا؛ باش وایە زیاتر لەوەندە لێ نەدا. جا ئەگەر پیتی (را) سکوندار بکەی هەمزەیەکی لەپێش دابنێی بیخوێنیەوە هەستی پێ دەکەی.

### ٦- التَّفشّي: بڵاوبوونەوە.

ئەمە بریتییە لە بڵاوبوونەوەی هەوا لەناو دەم لەکاتی دەربڕینی پیتی (ش).

### ٧- الإستطالة: درێژکردنەوە.

ئەمە بریتییە لە درێژکردنەوەی دەنگ لەسەرەتای لایەك لەلایەکانی زمان تادەگاتە کۆتایی/ ئەمەش پیتی (ض)ە، پیتی (ض) درێژدەکرێتەوە تا بەشوێنی دەرچوونی (لام) دەگەیەنرێ.

(أبو أيمن) لە (أطلس التجويد) بەم شێوە پێناسەی (الإستطالة)ی کردووە (هي اندفاع اللسان من مؤخرة الفم إلى مقدمته حتى يلامس رأس اللسان أصول الثنيتين العليتين، وذلك تحت تأثير الهواء المضغوط خلف اللسان) واتە (استطالة) بریتییە لە پاڵدانی زمان لەکۆتایی دەمەوە تا پێشەکەی تا سەری زمان دەنووسێ بەڕەگی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو هەوا پاڵنراوەی لای دیوی سەرەوەی زمانە.

# أحكام النون الساكنة والتنوين[1]

## ( حوکمەکانی نونی سکوندار و تەنوین )

هەرکاتێك نونی زەنەدار یا تەنوین پیتەکانی زمانی عەرەبیان لەدوا هات چوار باریان بۆ دروست دەبێت کەئەمانەن:

١- الأدغام – تێکهەڵکێشان

٢- الإقلاب – وەرگێڕان

٣- الإخفاء – شاردنەوە

٤- الإظهار – ئاشکراکردن.

### ١- الإدغام:

(إدغام) دەبێتە دووبەش کەئەمانەن:

#### (أ) ادغام بغنة[2] – تێکهەڵکێشانی بەمینگە.

ئەمەش لەوکاتە دەبێت کە نوونی زەنەدار یا تەنوین یەکێك لەم چوار پیتەی لەدوا بێت (ی، ن، م، و) کەلەوشەی (یَنْمُو) کۆدەبنەوە، ئەوکاتە نونە زەنەدارەکە یا تەنوینەکە تێکهەڵدەکێشرێ لەگەڵ ئەو پیتەی کەلەدوای دێت وەکو یەك پیتی شەددەداری لێ دێت لەجنسی پیتی دووەم لەگەڵ مینگە (غنة) ئەمجۆرە تێکهەڵکێشانەش دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

---

(١) تنوین: نونێکی زەنەدارە دەکەوێتە کۆتایی ناوان (الأسماء) بەنوونێکی زەنەدار دەخوێنرێتەوە بەلام بەنووسین وەکو نوونێکی زەنەدار نانوسرێ، وەك: (کتابٌ، کتابٍ، کتاباً) لەکاتی گەیاندن (وصل) بەم شێوەیە دەخوێنرێن (کتابُنْ، کتابِنْ، کتابَنْ) بەلام لەکاتی وەستان لەسەری تەنوینەکە نامێنێ بەمجۆرە: (کتابْ، کتابْ، کتابا).

(٢) مینگە (غنة) دەنگێکە لەکونە لووتەکان دەردەچێت، بۆ زیاتریش سەر لە (مخارج الحروف) بدە.

### ١- الإدغام الكامل بغنة:

ئەمەش لەگەڵ دوو پیت دەبێت (ن) وە (م) لەم بەشەدا نوونی سکون دارو تەنوینەکە بەتەواوی دەغم دەکرێ لەگەڵ (ن) و (م)ەکە بۆیە لە قورئانەکان شەددە لەسەر (ن) و (م) کراوە.

### ٢- الإدغام الناقص بغنة:

ئەمەش لەگەڵ دووپیت دەبێت (و) وە (ي).

لەم بەشەدا نوونە سکون دارەکەو تەنوینەکە شوێنەوارێکی دەمێنێ لەکاتی دەغم، بۆیە لەقورئانەکان شەددە لەسەر (و) و (ي) نەکراوە.

نموونە لەسەر (ادغام بغنة)

| تەنوین | نوونی زەنەدار | پیتەکان |
|---|---|---|
| فئة ينصرونه | منْ يقولُ | ي |
| لقومٍ يؤمنون | انْ يقولوا | |
| سراجا وهاجا | منْ ورائهم | و |
| جناتٍ وعيون | منْ وليّ | |
| صراطٍ مستقيم | منْ ملجا | م |
| هدىً من | منْ ماء | |
| ملكا نُقاتل | عنْ نفس | ن |
| رسولاً نبيًا | انْ نقول | |

### (ب) إدغم بلاغُنّة - تێکهەڵکێشانی بێ مینگە.

ئەمە بریتییە لەوەی هەرکاتێك کەنوونی زەنەدار یا تەنوین پیتی (لام) یا (را)ی لەدوا دێت ئەوکاتە تێکهەڵدەکێشرێن بە شێوەیەك لێ دەکرێن وەك یەك پیتی شەددەدار لەجنسی پیتی دووەم بەبێ مینگە ئەم جۆرە تێکهەڵکێشانەش پێی دەوترێت (ادغام کامل) واتە تێکهەڵکێشانی تەواو

چونكە پیتی یەكەم بەخۆی و بەسیفەتەكەیەوە نامێنێ، وەك:

| پیتەكان | نوونی زەنەدار | تەنوین |
| --- | --- | --- |
| ل | ان لن | انداداً لیضلوا |
| | ان لو | هدىً للمتقین |
| ر | ان رءا | بشراً رَسُولا |
| | من ربك | غفورٌ رَحیم |

روونكردنەوە لەبەشی (إدغام)

١- تێكهەڵكێشان (ادغام) دەبێ لە دوو وشە دابێت، نابێت لەیەك وشەدابێ ئەمەش لەچوار وشە لە قورئان دا هاتووە كە ئەمانەن: (الدنیا، صنوان، بنیانهم، قنوان).

٢- لەم دوو شوێنەدا كە نوونی زەنەدار واوی لەدوا دێت دەغم ناكرێن.

أ- (یس والقرآن الحكیم) ب- (ن والقلم).

٢- الإقلاب[١] : وەرگەڕان

(اقلاب) بریتییە لەوەی هەركاتێك لەدوای نوونی زەنەدار یا تەنوین پیتی (ب) هات جا لەیەك وشەدابوون یا لەدوو وشە، نوونە زەنەدارەكە یا تەنوینەكە دەكرێ بەمیمێكی خەفیف لەگەڵ مینگە وەك:

(مِن بَعْد) لەدوای اقلاب دەخوێنرێتەوە (مِمْبَعد)

(الأنبیاء) لەدوای اقلاب دەخوێنرێتەوە (الأمْبیاء)

(علیمٌ بِذات) لەدوای اقلاب دەخوێنرێتەوە (علیمُمْبِذاتِ)

تێبینی/ لەكاتی (إقلاب) دوو لێوەكان بەنەرمی بەیەكیەوە دەنووسێن.

---

(١) اقلاب: لەزمانەوانی دا واتە (تحویل الشيء عن وجهه) یانی شتێك وەربگێڕی، وە هەندێك بۆ ئەم بەشە وشەی (قَلْب) بەكاردەهێنن.

## ٣- الإظهار: ئاشكراكردن.

ئەمە بریتییە لەوەی هەرکاتێك کەلەدوای نوونی زەنەدار یا تەنووین یەکێك لەم شەش پیتانە هات (ء، هـ، ع، ح، غ، خ) [1] جا لەیەك وشە دابوون یا لەدوو وشە ئەوکاتە نوونە زەنەدارەکە یا تەنوینەکە ئاشکرا دەکرێت بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێك بەسەریان دابێت وەك:

| پیت | (نْ) لەیەك وشەدا | (نْ) لەدوو وشەدا | تەنوین (ـٌ) |
|---|---|---|---|
| ا | يَنْأَوْنَ | مَنْ آمَنَ | رسولٌ أمينٌ |
| هـ | يَنْهَوْنَ | إنْ هو | سَلامٌ هيَ، جُرُفٍ هارٍ |
| ع | يَنْعِقُ | مَنْ عِلْمٍ | سميعٌ عليم |
| ح | يَنْحِتُونَ | مِنْ حَسَنَةٍ | عليمٌ حكيم |
| غ | يَنْغِضُونَ | مِنْ غِلٍ | عزيزٌ غفور |
| خ | والمُنْخَنِقَةُ | مِنْ خَيرٍ | فُلاناً خليلا |

## ٤- الأخفاء: شاردنەوە

(اخفاء بریتییە لەوەی هەرکاتێك کەلەدوای نوونی زەنەدار یا تەنوین یەکێك لەم پازدە پیتەی لەدوا هات کەئەمانەن (ص، ذ، ث، ك، ج، ش، ق، س، د، ط، ز، ف، ت، ض، ظ) ئەم پازدە پیتە کۆدەبنەوە لەسەرەتای وشەکانی ئەم هۆنراوەیە:

صف ذا ثنا کَمْ جاد شخص قد سما

دم طيبا زد في تقى ضع ظالما

---

(١) ئەم پیتانە پیتەکانی (حلق)یان پێ دەوترێ چونکە هەموویان لەقوڕگ دەردەچن.

ئینجا لەیەك وشەدا بوون یا لەدوو وشە پێویستە نوونە زەنەدارەکە یا تەنوینەکە مینگەی تێدا بکرێت وە بەشێوەیەك لێ بکرێت کە بکەونە نێوانی (إظهار) و (ادغام) واتە نەوەکو (اظهار) ئاشکرا بکرێت نەوەکو (ادغام)میش دەغم بکرێ وەك:

| پیت | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | لەگەڵ تەنووین |
|---|---|---|---|
| ص | يَنصُرُكم | مِنْ صياصيهم | جِمالَةٌ صُفْر |
| ذ | انذرهم | مِن ذهبٍ | وطعاماً ذا |
| ث | منثورا | مِن ثَمرةٍ | نطفةٍ ثُمَّ |
| ك | انكالاً | اَن كانَ | واَجرٍ كريم |
| ج | اَنجاكم | اَن جاءكم | صعيداً جُرُزا |
| ش | مَنشُورا | لِمَن شاء | جبَاراً شقيا |
| ق | يَنقلبون | اَن قد | عفواً قديرا |
| س | الانسان | مِنْ سُلالة | قيلاً سلاما |
| د | اَنداداً | مِنْ دابَّة | دكاً دكاً |
| ط | فانْطلقا | مِن طينٍ | بلدةٌ طيبة |
| ز | اَنزلنا | مِنْ زكَّاها | نفساً زكيا |
| ف | انفسكم | مِنْ فوقهم | احداً فقولى |
| ت | كنتم | مَن تابَ | نعمةٍ تجزى |
| ض | منضُود | وَمَن ضَلَّ | وكُلاً ضَرَبنا |
| ظ | يَنظرون | مِن ظل | ظلاً ظليلا |

## تێبینی:

١- دەنگی نون و تەنوین ئەگەر (إخفاء) كران گەورە دەكرێن، ئەگەر پیتێكی گەورەیان لەدوا هات وەك (مِن قبل-منصوراً) وەك لێرە دەبینین (ق) وە (ص) لەدوای (ن) هاتوون كە هەردووكیان پیتی (استعلاء)ن.

٢- وە دەنگی نون و تەنوین ئەگەر (إخفاء) كران باریك دەكرێن ئەگەر پیتێكی باریكیان لەدواهات وەك (أن كان-الإنسان).



# أحكام اللام

١- لامی شەمسی و قەمەری.

٢- لامی ناوی خوا (لام لفظ الجلالة).

٣- لامی سکون دار لە (اسم) و (فیعل) و (حرف)دا.

## ١- لامی شەمسی و قەمەری: [١]

**(أ) لامی قەمەری:**

پێویستە لامی (اَلـ)ی ناسێنەر (المعرّف) ئاشکرا بکرێت ئەگەر هات و لەپێش ئەم چواردە پیتە هات:

(ا، ب، غ، ح، ج [٢]، ك، و، خ، ف، ع، ق، ی، م، ه).

ئەم چواردە پیتە لە وشەکانی ئەم رستەیەدا کۆدەبنەوە، (إبغ حَجّكَ وخَفْ عَقيمه). وەك:

| پیت | نموونەکەی | پیت | نموونەکەی |
|---|---|---|---|
| ا | الانعام | خ | الخَوف |
| ب | البقر | ف | الفائزون |
| غ | الغنم | ع | والعاديات |
| ح | الحاقة | ق | القرآن |
| ج | الجنة | ي | الياقوت |
| ك | الكافر | م | الموت |
| و | الواقعة | هـ | الهدى |

(١) (اَلْ)ی ناسێنەر تەنها دەچێتە سەر ناو (اسم) ناچێتە سەر فیعل و حەرف، جا کاتێك (اَلـ)ی ناسێنەر دەچێتە سەر (اسم)ێك ئەو ناوە دەناسرێ بۆ نموونە دەڵێی (مدرسە) واتە: قوتابخانەیەك بەڵام قوتابخانەکە نەناسراوە، بەڵام کە (اَلـ)ی ناسێنەرت خستە سەری گوتت (المدرسة) ئەوکاتە دەناسرێ واتە قوتابخانەکە.

(٢) خەڵکی وا هەیە کاتێك کە (اَلْ)ی ناسێنەر پیتی (ج)ی لەدوا دێت لامەکە ئاشکرا ناکەن بەڵکو ئەغمی دەکەن لەگەڵ جیمەکەدا ئەمەش هەڵەیە.

(ب) لامی شەمسی:

کاتێك کە لامی (ألـ)ی ناسێنەر ئەم چواردە پیتەی لەداهات (ط، ث، ص، ر، ت، ض، ذ، ن، د، س، ظ، ز، ش، ل) لامەکە لەگەڵیدا دەغم دەکرێ بەبێ مینگە تەنها لەگەڵ پیتی (نون) مینگەی لەگەڵدا دەبێت.

| پیت | نموونەکەی | پیت | نموونەکەی |
|---|---|---|---|
| ط | الطّامّة | ن | النّاس |
| ث | الثّمرات | د | الدّين |
| ص | الصّابرين | س | السّاجدون |
| ر | الرّسول | ظ | الظّانين |
| ت | التّقوى | ز | الزّقوم |
| ض | الضّالين | ش | الشّمس |
| ذ | الذّكر | ل | اللّطيف |

**تێبینی لەلامی شەمسی و قەمەری:**

١- بۆ ناسینی لامی شەمسی و قەمەری لە قورئاندا ئەگەر پیتەکەی دوای لامەکە شەددەی هەبوو لامی شمسیە بەڵام ئەگەر شەددەی نەبوو لامەکە سکونی هەبوو ئەوە لامی قەمەرییە.

٢- بۆیە لامی قەمەری بەو ناوە ناوبراوە چونکە وشەی (الْقمر) لامەکەی ئاشکرا دەکرێت، وە لامی (شمسی)ش بۆیە بەم ناوە ناوبراوە چونکە وشەی (الشمس) لامەکەی دەغم دەکرێ لەگەڵ پیتی دوای خۆی.

٣- (الـ)ی (السنتكم والْوانكم) ئەوانە (الـ)ی ناسێنەر نین بەڵکو بەشێکن لە ناوەکە.

٤- ئەو لامانەی کەلەسەر فیعلن ئەوە وەکو قەمەری و شەمسی حساب

نـاكرێن وەك (إلْتقـى، اْلهـاكم، إلْتقتـا) وە هـەروەها (الـ)ی (الأسـم الموصل)يش وەك:

(الَذي، الَتي، الَذين، الْذين)

**٢- لامی ناوی خوا (لام لفظ الجلالة)**

(أ) لامی وشەی (الله) قەڵەو دەكرێ لەم بارانەی لای خوارەوە:

١- ئەگەر هیچ پێشی نەكەوت وەك (**الله لا إله الا هو الحي القيوم**).

٢- ئەگەر پیتەكەی پێشی سەر (فتحە)ی هەبوو وەك (**قالَ الله**).

٣- ئەگەر پیتەكەی پێشی بۆر (ضمة)ی هەبوو وەك (**عبدُ الله**).

٤- ئەگەر پیتەكەی پێشی زەنە (سكون)ی هەبوو پێش زەنەكەش بۆر هەبوو وەك: (قالُوا اللهم).

٥- ئەگەر پیتەكەی پێشی زەنەی هەبوو پێش زەنەكەش سەر هەبوو وەك (و إلى الله).

(ب) لامی وشەی (الله) وەك لامێكی ئاسایی دەخوێنرێتەوە لەم حاڵەتانەی لای خوارەوە:

١- ئەگەر پێش ناوی خوا ژێر (كسرة) هەبوو وەك (بسم الله الرحمن الرحيم) وە هەروەها ئەگەر ژێرەكە لەهەمان وشەشدابوو هەروایە وەك

﴿لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾.

٢- ئەگەر پیتەكەی پێشی زەنەی هەبوو پێش زەنەكەش ژێر هەبوو وەك (وينَجِّى الله).

٣- ئەگەر پیتەكەی پێشی تەنوینی هەبوو وەك:

(قوماً الله) ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾.

**٢- لامی سکون دار لە ( اسم ) و ( فعل ) و ( حەرف ):**

(أ) لامی سکونداری ئەسڵی لەناو (اسم)دا پێویستە ئاشکرا بکرێت وەك (سلطان، سَلْسبيلا، السنتكم، الفافاً، الذي، التي).

(ب) لامی فعل دەبێ ئاشکرا بکرێت جا فیعلەکە رابردوو (ماضي) بوو وەك (جَعَلْنا، فَالْتقى الماءُ) یا رانەبردوو بوو وەك (يلْتقيان، يلْتقطه) یا ئەمر بوو وەك (قلْ).

بەڵام ئەگەر لامی فیعل ئەمر لام و رای لەدوا هات ئەوە دەغم دەکرێن وەك:

وقُل ربِّ   لەدوای دەغم کردن دەخوێنرێنەوە (و قُرَّبِّ)

قلْ لا املك لەدوای دەغم کردن دەخوێنرێتەوە (قلّا املك)

وە هەروەها دەبێ ئەو لامە سکون دارەی کە بەشێك نییە لە پێکهاتەی وشەکەو دەچێتە سەر (فعل مضارع) و دەیگۆڕێ بۆ شێوەی (امر) ئەم لامەش دەبێ ئاشکرا بکرێت، وە بەمەرجیش گیراوە کەلەپێش ئەم لامە (ثُمَّ) یا (واو) یا (فاء) هەبێت، وەك ئەم نموونانە:

﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ﴾ (الحج: ٢٩) ﴿وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ﴾ (الحج: ٢٩) ﴿فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ﴾ (الحج: ١٥)

(ج) لامی حەرف دەبێ ئاشکرا بکرێت وەك (هلْ عسيتم-بلْ انتم) بەڵام ئەگەر لام و رایان لەدوا هات ئەوکاتە دەغم دەکرێن وەك: (هَل لك - بل لايخافون - بل ربّكم - بل رفعه الله).

# احكام الميم الساكنة

# ( حوكمەكانی میمی زەنەدار )

میمی سکون دار، کاتێك پیتەکانی زمانی عەرەبیان لەدوا دێت سێ باری بۆ دروست دەبێت کەئەمانەن:

١- الإدغام الشفوی[1] (تێکهەڵکێشانی لێوی).

٢- الإخفاء الشفوي (شاردنەوەی لێوی).

٣- الإظهار الشفوي (ئاشکراکردنی لێوی).

## ١- الإدغام الشفوي:

هەرکاتێك میمی زەنەدار پیتی میمی لەدوا هات ئەوکاتە میمی یەکەم تێکهەڵدەکێشرێ لەگەڵ میمی دووەم دەبنە یەك میمی شەددەدار لەگەڵ مینگە (غنە) وەك:

(واللە یَعِدُکم مغفرة) (لهم ما یشاءُون فیها).

## ٢- الإخفاء الشفوي ( شاردنەوەی لێوی ):

هەرکاتێك لەدوای میمی سکون دار پیتی (ب) هات ئەوکاتە میمە زەنەدارەکە دەکرێتە میمێکی خەفیفی بەمینگە وەك:

---

(١) ئەمانە بۆیە پێیان دەوترێ (الإدغم الشفوي) (الإخفاء الشفوي) (الإظهار الشفوي) چونکە پیتی (م) لەنێوانی دوو لێوەکان دەردەچێ (الشفة) واتە: لێو وە (الشفتان) واتە: دوو لێوەکان وە (شفوي) واتە: لێوی بەکارهێنانی ئەم زاراوانە (ادغام) و (اخفاء) و (اظهار)ی (أحکام المیم الساکنة) جیا دەکەنەوە لە (ادغام) و (اخفاء) و (اظهار) ی (احکام النون الساکنة والتنوین) واتە زیادکردنی وشەی (الشفوي) بۆ بارەکانی میمی سکوندار.

(وما هم بخارجين) (انّ ربهم بهم).

تێبینی/ لەکاتی (الأخفاء الشفوي)دا دوو لێوەکان بەنەرمی بەیەکترەوە دەنووسێن.

**٢- الإظهار الشفوي ( ئاشکراکردنی لێوی ):**

ئەگەر لەدوای میمی زەنەدار جگە لەپیتی (م-ب) هەر پیتێکی تر هات میمەکە ئاشکرا دەکرێت بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی بەسەردابێت، بەتایبەتی لەگەڵ پیتی (ف-و) زیاتر ئاشکرا دەکرێت وەك:

(المْ ترَ) (يمْشي) (وهُمْ فيها) (وقلوبهم وجلة).

<u>احكام الميم والنون المشددتين (حوکمەکانی میم و نوونی شەددەدار)</u>

ئەگەر هات و (م-ن) شەددەدار بوون پێویستە دوو مەرجی لێ بێنیە جێ، یەکەم شەددەکردن، دووەم مینکە، جا لەیەك وشەدابوو یا لەدوو وشە وەك: امّا - ثمَّ - كم من فئة - إنَّ - الجنّة - إن نشا - من نفْسٍ.

## أحكام الرّاء ( حوكمەكانی پیتی راء )

پیتی (را) سێ باری هەیە:

١- گەورەکردن (التفخیم).

٢- گچکەکردن (الترقیق).

٣-خوێندنەوەی بەهەردوو بار (جواز الوجهین).

### ١- گەورەکردن ( التفخیم ):

پیتی (را) لەم شوێنانەی لای خوارەوە بەگەورە دەخوێنرێ:

١- ئەگەر بۆر یا سەری هەبوو وەك (عشرُون - ربَب).

٢- ئەگەر خۆی زەنەدار بوو پیتەکەی پێشی بۆر یا سەری هەبوو وەك: (غُرْفَة - قَرْيَة).

٣- ئەگەر خۆی زەنەدار بوو پیتەکەی پێشی ژێری تووشهاتووی هەبوو (کسر عارض)[1] وەك (ارْجعوا - أم ارْتابوا - إن ارْتَبْتُمْ).

٤- ئەگەر بەخۆی زەنەدار بێت وە پیتەکەی پێشی ژێری ئەسڵی خۆی هەبێت وە پیتەکەی پاشی پیتی (استعلاء)[2]ێ ژێردار نەبێت وەك: (قِرْطاس - مرصاداً - فِرْقَة - وإرصاداً - لَبِالمِرْصاد) هەر ئەو پێنج وشەش هەیە لەقورئان.

بەڵام ئەگەر ئەومەرجانەی باسمان کرد هەبوو بەڵام پیتە (استعلاء)ەکە لەوشەیەکی تربوو لەناو یەك وشەدا نەبوون ئەوکاتە پیتی (را)یەکە

---

(١) (کسر عارض) ژێری تووشهاتوو لێرەدا مەبەستمان ئەو کەسرەیە کە لەئەسڵدا هی خۆی نییە، بەڵکو لەئەنجامی بەیەکگەیشتنی دوو پیتی سکووندار ئەو بووە بە کەسرە، ئەوەك ئەو خۆی لەبنەڕەتدا سکون بووە.

(٢) (استعلاء) پیتەکانی (استعلاء) حەوتن کە ئەمانەن: ( خص ضغط قظ).

بەباریکی دەخوێنرێتەوە وەك (أنذِرْ قومك) وە (ولا تُصعِّرْ خَدَّك).

٥- ئەگەر پیتی (را) کەوتبووە کۆتایی وشە لەسەری وەستای کردت بەسکون دار وە پیتەکەی پێشیشی سکون دار بوو پێش ئەم سکوونەش سەر یا بۆر هەبێت بەمەرجێك پیتەکەی پێش (را) (یا) نەبێت وەك: (القدْرْ - والعَصْرْ - اليُسْرْ - العُسْرْ - الأمُوْرْ - غفّار - النُّوْرْ - غفُوْرْ).

**٢- گچکەکردن (الترقيق):**

پیتی (را) لەم شوێنانەی لای خوارەوە بەگچکەو باریکی دەخوێنرێنەوە:

١- ئەگەر ژێری هەبوو وەك (رِزْقا).

٢- ئەگەر خۆی زەنەداربوو پیتەکەی پێشی ژێری ئەسڵی خۆی هەبوو وە یەکێك لەپیتەکانی (استعلاء)ی لەدوا نەهاتبێ وەك (شِرْعَة - فِرْعَون - شِرْذِمَة).

٣- ئەگەر پیتی (را) کەوتبووە کۆتایی وشە لەسەری وەستای کردت بە سکون دار پێش سکونەکەش یایەکی سکوندار هەبوو وەك: (خَبِيْرْ - خَيْر - بَصِيْر).

٤- ئەگەر پیتی (را) کەوتبووە کۆتایی وشە لەسەری وەستای کردت بە زەنەدار لەپێش ئەم (را)یە سکونەدارە پیتێکی سکوندار هەبێت بەڵام پیتی (استعلاء) نەبێت وە پێش ئەم سکون دارەش کەسرەدار هەبێت وەك (الذِّكْرْ - سِحْرْ - حِجْرْ).

٥- ئەگەر لەسەر وشەیەك وەستای کۆتاییەکەی پیتی (را) بوو کردت بەسکون دار پێش ئەم (را)یەش پیتێکی کەسرەدار هەبوو وەك: (مُنْذِرْ - المُدَّثِرْ - فأنْذِرْ - فَطَهِّرْ - قُدِرْ).

**٢- خوێندنەوەی بەهەردوو بار ( جواز الوجهین ):**

پیتی (را) لەم شوێنانەی لای خوارەوە دەتوانی بەگەورەیی یا بەگچکەو باریکی بیخوێنیتەوە:

١- ئەگەر خۆی زەنەدار بوو وە پیتەکەی پێشی ژێری ئەسڵی خۆی هەبوو وە پیتەکەی پاشیشی پیتی (استعلاء)ی ژێرداربوو وەك (كُلُّ فِرْقٍ) هەر ئەم وشەش لە قورئاندا هەیە دەتوانی ئەگەر لەسەری وەستای یا نەوەستای بەگەورە یا بەباریکی (را)یەکە بخوێنیەوە.

٢- ئەگەر لەسەر وشەیەك وەستای کۆتاییەکەی پیتی (را) بوو کردت بەسکون دار وە پیتەکەی پێشی پیتی (استعلاء)ی زەنەداربوو پێش پیتە (استعلاء)ەکە پیتێکی ژێردار هەبوو وەك (مِصْرَ – القِطْرِ).

وە وا ئیختیار کراوە کە (را)ی (مصر) بەگەورەیی بخوێنرێ وە (را)ی (القطر) بەباریکی.

٣- لەم وشانەدا (إِذَا يَسْرِ – أَنْ أَسْرِ – فَأَسْرِ) وە هەروەها وشەی (وَنُذُرِ) لە شەش شوێن لەسوورەتی (قمر) ئەگەر لەسەریان وەستای کردنت بە زەنەدار دەتوانی (را)یەکە بەقەڵەوی یا بەلاوازی بخوێنیتەوە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەم وشانە لەدوای پیتی (را)یەکانیان یایەکی قرتێنراو (محذوف) یان هەبووە.

## سەکتە (السكتات فی القرآن)

سەکتە بریتیە لە وەستانێکی کەم بەبێ هەناسەدان بەقەد دوو حەرەکە بەمەبەستی بەردەوام بوون لەسەر خوێندنی قورئان ئەمەش لەچوار شوێن یەکدەنگی لەسەر هەیە کەئەمانەن:

١- نێوانی دوو وشەی (عوجاً) وە (قیماً) لە سورەتی (کهف) ئایەتی (١-٢).

٢- نێوانی دوو وشەی (مرقدنا) وە (هذا) لە سورەتی (یس) ئایەتی (٥٢).

٣- نێوانی دوو وشەی (مَن) وە (راق) لە سورەتی (القیامة) ئایەتی (٢٧).

٤- نێوانی دوو وشەی (بل) وە (ران) لەسورەتی (المطففین) ئایەتی (١٤).

**ئەوەی کە جیاوازی لەسەرە دوو شوێنە:**

١- نێـوانی سـورەتی (الأنفـال) و (التوبـة) جگـە لەسـەکتە گەیانـدن و وەستان تێیدا جائزە، وەك لەپێشدا باسمان کردووە.

٢- نێوانی دوو وشەی (مالیة) وە (هلك) لە سورەتی (حاقة) ئایەتی (٢٨-٢٩) جگـە لـە سـەکتە دوو رووی تریـشی تێـدا جـائزە تێکهەڵکێـشان و وەستان.

**تێبینی:**

وشەی (عوجاً) کەوتۆتە کۆتایی ئایەت و وە (مرقدنا) کۆتایی قسەی کافرانە جائزە لەسەریان بوەستی لەبەر ئەوە وەستانی تەواوە (الوقف التام) وە دەشتوانی بیگەیەنی بەوەی دواوە بەسەکتە.

بەڵام (مَن راق) وە (بل ران) جائز نییە وەستان لەسەر (مَنْ) وە (بَلْ) لەبەرئەوە شوێنی وەستان (وقف) نین بەڵکو پێویستە (سکتة)ی تێدابکرێ و ئاشکرا بکرێن واتە لام و نوونەکە دەغم نەکرێن لەگەڵ (را) کەلە دوایان دێت.

## التقاء الحرفين الساكنين/ بەیەك گەیشتنی دوو پیتی سكوندار

**یەکەم:** دروستە کۆکردنەوەی دوو پیتی سکوندار لەیەك وشەدا لە دوو باردا:

ا-ئەگەر پیتی سکونداری یەکەم پیتێکی مەد یا لین بوو وەك:

الضالين-اتحجُونّي-ياسينْ-نونْ-عينْ

ب-ئەگەر سکونی پیتی دووەم (عارض) بوو وەك:

الحسابْ- تعلمُونْ- خَوفْ- من بَعْدْ-القَدْرْ

**دووەم:** ئەگەر دوو سکون لە دوای یەك هاتن بەڵام لە دوو وشەدا بوون بە دوو رێگە خۆ دەرباز دەکرێ لەم حاڵەتەدا:

ا-ئەگەر پیتی سکونداری یەکەم پیتی مەددی بوو ئەوە تەنها بە خوێندنەوە پیتە مەددییەکە ناخوێندرێتەوە و (حذف) دەکرێ وەك

(وقالا الحمد لله) (وإذ قالُوا اللّهمّ) (أفي الله شكٌ)

ئەمانە لەکاتی گەیاندن (وصل) بەم شێوەیە دەخوێندرێنەوە(وقالَ الحمد لله) (وإذ قالُ اللهم) (أفِ الله شك)

ب-بە حەرەکەدارکردنی پیتی سکونداری یەکەم ئەگەر پیتەکە پیتێکی (صحیح) بوو یان پیتێکی (لین) بوو وەك:

(منِ الله) (كُتبَ عليكمُ القتالُ) (قُلِ اللهمّ) (دعَواْ الله) بۆ زیاتریش سەر لە (تێبینی)بدەکە لە دوای هەمزەی (وصل) لە (فعل) دا هاتووە.

# درێژكردنەوە ( اَلْمَدُّ ) (١)

درێژكردنەوە (مدّ) ئەم بابەتانە دەگرێتەخۆ:

١–مانای ( مدّ) لە زاراوەدا (إصطلاح).

٢–پیتەكانی درێژكردنەوە.

٣–المد الطبيعي (درێژكردنەوەی سروشتی).

٤–المد المتصل (درێژكردنەوەی پێكەوە لكاو).

٥–المد المنفصل (درێژكردنەوەی جوێ).

٦–المد العارض للسكون (درێژكردنەوە بەهۆی زەنەی تووشهاتوو)

٧–المد اللازم المثقل الكلمي.

٨–المداللازم المخفف الكلمي.

٩–المد اللازم الحرفي المثقّل.

١٠–المد اللازم الحرفي المخفف.

١١–باسێك لە پیتەكان.

١٢–مد الصلة الصغرى (درێژكردنەوەی راناوی لكاوی گچكە).

١٣–مد الصلة الكبرى ( درێژكردنەوەی رانای لكاوی گەورە).

١٤–مد البدل (درێژكردنەوەی گۆڕاو).

١٥–مد العوض (درێژكردنەوەی لە جیاتی).

١٦–مد اللين (درێژكردنەوەی نەرم).

١٧–مد الفرق (درێژكردنەوەی جیاوازی).

---

(١) لە باسی (مد) پێم باش بوو سەرەبابەتەكان بە عەرەبی بنووسم چونكە بەم شێوەیە خوێنەر و قوتابی باشتر تێدەگەن و هەزمی دەكەن، وە بابەتەكانیش یەك یەك راڤە یكەم وەك ئەوەی كە نووسیومە بێ ئەوەی بڵێم ئەوە دابەش دەبێت بۆ دوو بەش و ئەو بەشەش بۆ ئەوەندە بەش چونكە پێم وایە ئەمە ئاڵۆزییەك بۆ خوێنەران دروست دەكات، هەرچەندە ئەگەر پێویستیش بوو ئەوە ئاماژە بۆ ئەم پەیوەندییانە دەكەم.

### ١-ماناى ( مد ) له زاراوەدا ( إصطلاح )[١]

(مـد)[٢] لـه زمانەوانيـدا (في اللغـه) واتـه: درێژکردنـەوه، بـەلام لـەزاراوەدا (اصـطلاح القُـرّاء) بريتييـه لـه درێژکردنـەوەى دەنـگ لـەکاتى دەربـڕينى پيتەکانى (مد).

### ٢- پيتەکانى درێژکردنەوه ( الحروف المد )

پيتەکانى درێژکردنەوه ژمارەيان سێ پيته که ئەمانەن:

١. ـَا ئەليفى زەنەدار که پيتەکەى پێشى سەرى هەبێت.

٢. ـِيْ يائى زەنەدار که پيتەکەى پێشى ژێرى هەبێت.

٣. ـُوْ واوى زەنەدار که پيتەکەى پێشى بۆرى هەبێت.

### جۆرەکانى درێژکردنەوه ( مَد )

*درێژکردنەوه دەکرێته دوو بەش*

يەکەم: درێژکردنەوەى سروشتى (المد الطبيعـي) ئەمـه کاتێك دەبێت کـه پيتـەکانى مـەد زەنـه يـا هـەمزەيان لـه دوا نـەهات هـەر وەك لـه دواى ئـەم بابەته باسى دەکەين.

دووەم: درێژکردنـەوەى لقى (المـد الفرعـى) ئەمـەش ئـەو کاتـه دەبێـت کـه پيتەکانى مەد هەمزه يان زەنـەيان لـه دوادا بێت جا درێژکردنـەوه بەهۆى هەمزه دەبێت به دوو بەش (المد المتصل) وه (المد المنفصل).

وه درێژکردنەوەش بەهۆى زەنه دابەش دەبێت به دوو بەشى سەرەکى:

---

(١) (إصطلاح) واته : التعبير الخاص، يانى دەربڕين و ماناى تايبـەت کـه لـه کورديدا ماناى (زاراوه) يان بۆ داناوه.

(٢) مد: يانى درێژکردنەوه بەلام (مَدَدْ) واته: يارمەتى، پشتگيرى، جا بەکارهێنانى ئەم وشـەيه بەم شێوەيەش بڵێى (مَدَد يا رسول الله) يا (مدد يا فلان) جائز نييه و شيرکه.

یەكەم : (المد العارض للسكون).

دووەم: (المد بسبب السكون اللازم)

هەروەك بە درێژی ئەمەش باس دەكەین.

وە (مد الصلْة) دابەش دەبێت بە دوو بەش (مد الصلة الصغرى) وە (مد الصلة الكبرى)

جا ئەم پێشەكییە كورتەم بۆیە نووسی بۆ ئەوەی جارێكی تر لەباسی درێژكردنەوە (مد) دووبارەیان نەكەمەوە.

### ٣-المد الطبيعي ( درێژكردنەوەی سروشتی )

ئەمە بریتییە لەوەی هەر كاتێك پیتەكانی درێژكردنەوە ( ـَا، ـُو، ـِي ) زەنە یا هەمزەیان لە دوا نەهات ئەو كاتە بە قەد دوو حەرەكەی [1] درێژ دەكرێنەوە لەوكاتەی بیان گەیەنی یا لەسەرییان بوەستی وەك:

قَالَ، يَقُولُ، قِيلَ

### ٤-المد المتصل ( درێژكردنەوەی پێكەوە لكاو )

ئەگەر پیتەكانی درێژكردنەوە هەمزەیان لەدوا هات و لە ناو یەك وشەدا بوون پێویستە پیتە درێژكردنەوەكە بە قەد چوار حەرەكە یا پێنج حەرەكە درێژ بكرێتەوە وەك:

(جاءَ – سُوءَ–لِلْفُقَراءِ–سِيئَتْ – شاءَ)

بەڵام ئەگەر لەسەر (مد المتصل) وەستای هەمزەكە كەوتبووە كۆتایی وشەكە ئەو كاتەدەتوانی بەقەد (٤–٥–٦) حەرەكە پیتە مەددییەكە درێژ

---

(١) (حەرەكە) بریتییە لەو ماوەی كە پەنجەت دەچوقێنی یا دەیكەیتەوە نە پەلە بكەیت نە لەسەر خۆ بێت وە (حركە) بەم شێوەیەش پێناسە كراوە ( هي الفترة الزمنية اللازمة لنطق حرف متحرك) واتە: بریتییە لەو ماوەیەی كە پێویستە بۆ دەربڕینی پیتێكی حەرەكەدار وەك (قَ)، واوێك دوو حەرەكەیە ئەلفێك دوو حەرەكەیە یائێك دوو حەرەكەیە، بۆر سەر ژێر ئەمانە یەك حەرەكەن، سەر (فتحە)نیو ئەلیفە، بۆر (ضمة) نیو (واو)ە ژێر (كسرە) نیو (یا)ە.

یەکەم: (المد العارض للسکون)

دووەم: (المد بسبب السکون اللازم)

هەروەك بە درێژی ئەمەش باس دەکەین.

وە (مد الصِّلة) دابەش دەبێت بە دوو بەش (مد الصلة الصغری) وە (مد الصلة الکبری)

جا ئەم پێشەکییە کورتەم بۆیە نووسی بۆ ئەوەی جارێکی تر لەباسی درێژکردنەوە (مد) دووبارەیان نەکەمەوە.

### ٣-المد الطبیعي (درێژکردنەوەی سروشتی)

ئەمە بریتییە لەوەی هەر کاتێك پیتەکانی درێژکردنەوە ( ـَ أ، ـُ وْ، ـِ يْ ) زەنە یا هەمزەیان لە دوا نەهات ئەو کاتە بە قەد دوو حەرەکەی[1] درێژ دەکرێنەوە لەوکاتەی بیان گەیەنی یا لەسەریان بوەستی وەك:

قالَ، یقُولُ، قیل

### ٤-المد المتصل (درێژکردنەوەی پێکەوە لکاو)

ئەگەر پیتەکانی درێژکردنەوە هەمزەیان لەدوا هات و لە ناو یەك وشەدا بوون پێویستە پیتە درێژکردنەوەکە بە قەد چوار حەرەکە یا پێنج حەرەکە درێژ بکرێتەوە وەك:

(جاء – سُوء–للفُقَراء –سِیئَتْ – شاءَ)

بەڵام ئەگەر لەسەر (مد المتصل) وەستای هەمزەکە کەوتبووە کۆتایی وشەکە ئەو کاتەدەتوانی بەقەد (٤–٥–٦) حەرەکە پیتە مەددییەکە درێژ

---

(١) (حەرەکە) بریتییە لەو ماوەی کە پەنجەت دەچوقێنی یا دەیکەیتەوە نە پەلە بکەیت نە لەسەر خۆ بێت وە (حرکە) بەم شێوەیەش پێناسە کراوە ( هي الفترة الزمنیة اللازمة لنطق حرف متحرك) واتە: بریتییە لەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ دەربڕینی پیتێکی حەرەکەدار وەك (قَ)؛ واوێك دوو حەرەکەیە ئەلفێك دوو حەرەکەیە یائێك دوو حەرەکەیە، بۆ سەر (زبر ئەمانە یاك حەرەکان، سەر (فتحە)نیو ئەلیفە، بۆر (ضمة) نیو (واو)ە ژێر (کسرە) نیو (یا)ە

بکەیتەوە وەك (للفقراء—شاء)

**٥-المد المنفصل (درێژکردنەوەی جوێ)**

ئەمەش بریتییە لەوەی هەر کاتێك کە پیتێکی مەددی هەمزەی لەدوا هات هەمزەکە لە هەمان وشەدا نەبوو، بەڵکو لە سەرەتای وشەیەکی تر بوو ئەو کاتە پیتە مەددییەکە بە قەد (٢-٣-٤-٥)[1] حەرەکە دەتوانی درێژ بکەیتەوە.

بەڵام ئەگەر لەسەر ئەم وشەیە وەستای کە پیتە مەددییەکەی تێدایە نەتگەیاند ئەو کاتە نابێ پیتە مەددەکە لە دوو حەرەکە زیاتر درێژ بکەیتەوە.

نموونە لەسەر (المد المنفصل)

(إنا أنزلناهُ — وتُوبوا إلى الله جميعاً— وفي أنفُسكم)

**تێبینی:**

(یا أیها الناسُ) ئەمە مەددی (منفصل)ە چونکە (یاأیها) دوو وشەیە وەهەروەها (هؤلاء) دوو مەددی تێدایە، مەددی یەکەم مەددی (منفصل)ە لەبەر ئەوە (هؤلاء) لە ئەسڵدا دوو وشەیە (ها—أولاء)

**٦-المد العارض للسكون (درێژکردنەوە بەهۆی زمنەی تووشهاتوو)**

ئەمە بریتییە لەوەی کاتێك کە لەسەر وشەیەك دەوەستی کۆتاییەکەی زەندار دەکرێت لەبەر وەستان لەسەری وە پیتی پێش کۆتاییەکەی پیتێکی مەددییە لەم کاتەدا دەتوانی پیتە مەددییەکە بە قەد (٦-٤-٢)

---

(١) يَمُدُّ المنفصل (في رواية حفص عن عاصم من طريق طيبة النشر)

بمقدار: (٢) قصراً أو (٣) أو (٤) أو (٥) حركات، ويمد المنفصل (في رواية حفص عن عاصم من طريق الشاطبية) بمقدار (٤) أو (٥) حركات.

حەرەکە درێژ بکەیتەوە، بەڵام شەشەکە لە هەموویان باشترە

وەك :

(والتين والزيتون– كُلٌّ مَنْ عليها فان– ملك يوم الدين)

بەڵام ئەگەر لەسەری ئەوەستای ئەم مەددە دروست نابێت.

تێبینی: ئەگەر قورئان خوێن بە یەکێك لەو ژمارانەی کە باسکرا دەستی کرد بە خوێندنی قورئان ئەوە تا کۆتایی خوێندنەوەکەی هەر لەسەر ئەم جۆرە درێژکردنەوە بەردەوام دەبێت جا دوو حەرەکە بوو یا چوار یا شەش.

**٧-المد اللازم المثقل الكلمي**

ئەمە بریتییە لەوەی هەر کاتێك پیتەکانی مەد زەنەیان لەدواهات زەنەکەش لەناو پیتێکی شەددەداردا بوو لە وشە ئەو کاتە پێویستە پیتە درێژکردنەوەکە بەقەد شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە وەك:

(ولا الضالّين– تأمرونّي – الحاقّة)

بۆ نموونە کە دەڵێن زەنەکە لەناو پیتێکی شەددەدار دا بێت وشەی (الحاقّة) پیتی قافەکە لە دوو قاف پێکهاتیە پیتی یەکەمی زەنەدار پیتی دووەمی فەتحەدارە لە ئەسڵدا بەم شێوەیە (الحاقْقَة).

**٨-المد اللازم المخفف الكلمي**

ئەمە بریتییە لەوەی هەر کاتێك پیتەکانی درێژکردنەوە زەنەیان لەدواهات زەنەکەش لەناو پیتێکی شەددەدار نەبێت پیتە درێژکردنەوە و زەنەکەش لە وشەدا بوون زەنەکەش، زەنەیەکی ئەسڵی بوو لە وشەکەدا ئەو کاتە پێویستە پیتە درێژکردنەوەکە بەقەد شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە ئەم مەددەش تەنها لە وشەی (ءآلْئن) هەیە لە دوو شوێن لە سورەتی (یونس) کە ئەمانەن:

١-﴿ ءَآلْـَٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ (یونس:٥١)

٢-﴿ءَآلْـَٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ (يونس: ٩١)

### ٩-المد اللازم الحرفي المثقل

ئەم درێژکردنەوە پەیوەندی بە پیتەکانەوە هەیە، پێویستە دەنگی پیتەکە لە سێ پیت پێك هاتبێ پیتی ناوەندی پیتی درێژکردنەوە بێت و پیتی کۆتاییەکەی تێکهەڵکێشرا بێت لەگەڵ پیتەکی وەکو خۆی وەك (ل) لە (الم).

وە پێویستە ئەم مەددەش بەقەد شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە (الم) پێویستە بەم شێوەیە بخوێنرێتەوە (ألفْ لاَمّيم).

### ١٠-المد اللازم الحرفي المخفف

ئەم درێژکردنەوەش باس لە درێژکردنەوەی ئەو پیتانە دەکات کە سەرەتای هەندێك لە سورەتەکانی قورئانی پێ کراوەتەوە، پێویستە دەنگی پیتەکە لە سێ پیت پێك هاتبێ پیتی ناوەندیی زەندار بێت و پیتی درێژکردنەوە بێت وە نابێ تێکهەڵکێشرا بێت لەگەڵ پیتێکی تر وەك (ص-ن-ق) وە وەك (س-ك) لە (يس-كهيعص).

ئەم مەددەش پێویستە بە قەد شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە تەنها پیتی (ع) نەبێت لە (حم عسق) وە (كهيعص) جائزە بە قەد چوار یا شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە بەڵام شەشەکە باشترە.

### ١١-باسێك لە پیتەکان

١-(٢٩) سورەت لە قورئان سەرەتاکانییان بە پیت کراوەتەوە کە کۆی هەموو پیتەکان (١٤) پیتە (ا-ل-م-ك-ق-ع-ص-ط-ه-ي-س-ح-ن-ر).

٢–یەك پیت لەم چواردە پیتە کە پیتی (ا) هەرچەندە لە کاتی خوێندنەوە بە سێ پیت دەخوێنرێتەوە بەم جۆرە (الِفْ).

بەڵام درێژ ناکرێتەوە چونکە پیتی مەددی تیا نییە وە لەوانەیە قورئانخوێنی وا هەبێت بە هەڵە ئەم پیتە بخوێنێتەوە بڵێ (الْف) واتە لامەکە بە سکون بخوێنێتەوە، بەم شێوە واتە هەزار بەڵام بە کەسرە لە ژێر لامەکە بەم شێوە (الِفْ) واتە پیتی ئەلیف.

٣–وەپێنج پیتیش لەمانە کە ئەم پێنج پیتەن (ح–ي–ط–ه–ر)
لە دوو وشە کۆدەبنەوە (حَيٌّ طَهُرْ) کە بەم شێوە دەخوێنرێنەوە (حا–یا–طا–ها–را) ئەمانە ئەلیفەکانیان بە قەد دوو حەرەکە درێژ دەکرێنەوە.

٤–وە هەشت پیت دەمێنێتەوە لەم چواردە پیتە کە ئەمانەن (ن–ق–ص–ع–س–ل– ك–م) کە لەم دوو وشەیەدا کۆ دەبنەوە (نَقُصْ عَسَلُكُمْ) بەم شێوەیە دەخوێنرێنەوە ( نون–قاف–صاد– عين– سين– لام–كاف–ميم)
ئەم هەشت پیتە هەموویان پێویستە بە قەد شەش حەرەکە درێژ بکرێنەوە گوتمان تەنها (ع) ئەبێت دەتوانی بە قەد چوار یا شەش حەرەکە درێژی بکەیتەوە، بەڵام شەشەکە باشترە: پیتی (عَيْنْ) ناوەندەکەی پیتی لینە.

### ١٢-مد الصلة الصغرى ( درێژکردنەوەی ڕاناوی لکاوی گچکە )

ئەمە بریتی لە (ه)ی ڕاناو (ضمیر) کە بۆ تاکی نێری نادیار بەکار دێت (هاء الضمیر للمذکر الغائب المفرد)

جا دەبێ ئەم هایە بۆر یا ژێری هەبێت، وە دەبێ بکەوێتە نێوان دوو پیتی حەرەکەدار واتە پیتی پاش و پێشی سکوندار نەبن وە هەمزەشی لە دوادا نەیەت ئەو کاتە پێویستە بۆرەکە یا ژێرەکە بە قەد دوو حەرەکە درێژبکرێنەوە وەك :

(وامرأتُهُ قائمةٌ) بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە (وامرأتُهُو قائمةٌ)

(إنهُ بعبادهِ خبیرٌ بصیر) بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە (إنهُو بعبادهِي خبیر بصیر)

### ١٣-مد الصلة الكبرى ( درێژکردنەوەی ڕاناوی لکاوی گەورە )

ئەمەش بریتییە لە (ه)ی ڕاناوکە بۆ تاکی نێری نادیار بەکاردێت، جا دەبێ ئەم هایە بۆر یا ژێری هەبێت، وە دەبێ بکەوێتە نێوان دوو پیتی حەرەکەدار، وە هەمزەشی بە دوا دا بێت ئەو کاتە پێویستە بۆرەکە یا ژێرەکە بە قەد دوو یا چوار یا پێنج (٢، ٤، ٥) حەرەکە درێژ بکرێتەوە وەك:

(ولهُ أجرٌ عظیم) بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە ( ولهُو أجر عظیم)

**چەند تێبینییەك لە (مد الصلة) دا:**

١-لە دوو جێگە لە قورئاندا پێچەوانەیە لەگەڵ (مد الصلە):

أ-﴿ويخلُدْ فيهِ مُهانا﴾ لە سورەتی فرقان لە ئایەتی (٦٩) دەخوێنرێتەوە (ويخلُد فيهي مهانا) هەرچەندە لێرە پێش های (فیە) یای سکوندار هەیە واتە حەرەکەدار نییە، بەلام هەر درێژدەکرێتەوە.

ب-﴿وإن تشكُروا يرضَهُ لكُم﴾ لە سورەتی (الزمر) ئایەتی (٧)

دەخوێنرێتەوە (وإن تشكروا يرضهُ لكم) واتە بەبێ درێژکردنەوەی بۆری سەر های (يرضهُ) هەرچەندە مەرجەکانی درێژکردنەوە هەیە.

٢-لە (مد الصلة) لە کاتی وەستان لەسەر ئەو وشەی کە هایەکە کەوتۆتە کۆتاییەکەی درێژ ناکرێتەوە، بەڵکو هایەکە دەکرێتە هایەکی زەنەدار وەك (ولهُ) کە وەستای لەسەری دەخوێنرێتەوە (ولهْ).

٣-ئەو هایەی کە یەکێکە لە پیتەکانی وشەکە ئەوە (مد الصلة) نییە وەك ﴿فواكهُ وهُم مُكْرمُون﴾ ﴿لئن لَّمْ تنتهِ لأرْجُمنَّك﴾.

٤-های دووەم لە (هذهِ) وەك (مد الصلة) حیسابی بۆ دەکرێ.

## ئەمانەی خوارەوە و وێنەی ئەمانەش ( مد الصلة ) نین چونکە مەرجەکانی ( مد الصلة ) یان تیادا نییە :

١- (فيهِ هُدى) چونکە پیتی پێش (هاء)ی ضمیر سکونداره.

٢-﴿اسمُهُ المَسيحُ﴾ چونکە پیتی دوای (هاء)ی ضمیر سکونداره.

٣-﴿يعلمْهُ اللهُ﴾ چونکە (هاء)ی ضمیر کەوتۆتە نێوان دوو پیتی زەنەدار.

٤-(أرجِهْ) چونکە (هاء)ی ضمیر سکونداره.

٥- (فألقهْ) چونکە (هاء)ی ضمیر سکونداره.

٦-(لمْ ينتهِ) چونکە پیتی (هاء)، (هاء)ی ضمیر نییە بەڵکو پیتێکە لە (أصل)ی فیعلەکە.

### ١٤-مد البدل ( درێژکردنەوەی برێتی )

ئەمە بریتییە لەو وشانەی کە لە بنەڕەتدا لە دوو هەمزە پێك هاتووە جا هەمزەی دووەم کە زەنداره گۆڕاوە بە پیتێکی مەددی بە گوێرەی حەرەکەی هەمزەی یەکەم واتە ئەگەر هەمزەی یەکەم فەتحەی هەبێت

هەمزەی دووەم بۆ (ئەلیف) گۆڕاوە ئەگەر هەمزەی یەکەم بۆری هەبێت هەمزەی دووەم گۆڕاوە بۆ (واو) وە ئەگەر هەمزەی یەکەم ژێری هەبێت ئەوە هەمزەی دووەم گۆڕاوە بۆ (یاء ئەم گۆڕانکارییانەش لەبەر قورسییە لەسەر زمان:

نموونە لەسەر (مد البدل)

| | | | |
|---|---|---|---|
| آدم | له بنەڕەتدا | أأدم | بووە |
| آزر | له بنەڕەتدا | أأزر | بووە |
| آمنوا | له بنەڕەتدا | أأمنوا | بووە |
| آمن | له بنەڕەتدا | أأمن | بووە |
| آسى | له بنەڕەتدا | أأسى | بووە |
| اوتوا | له بنەڕەتدا | أأتوا | بووە |
| أوذينا | له بنەڕەتدا | أأذينا | بووە |
| أوتي | له بنەڕەتدا | أأتي | بووە |
| إيمان | له بنەڕەتدا | إأمان | بووە |
| لإيلاف | له بنەڕەتدا | لإألاف | بووە |

جا ئەو هەمزەی دووەمەکە کە بووە بە پیتێکی مەددی بەقەد دوو حەرەکە پێویستە درێژ بکرێتەوە.

وە ئەو وشانەش کە بە (بدل) دەچن (شبیه بالبدل) ئەوانە پیتە مەددیەکانیان لە ئەسڵدا هەمزە نەبوونە، بەڵکو هەمزە پێش پیتێکی مەددی کەوتووە، وەك:

(قُرءان– مسئولا– اسرائيل–نبئوني)

وە ئەگەر پیتێکی مەددی (المد اللازم) وە (المد البدل)ی لەسەر کۆدەبۆوە ئەو کاتە کار بە (لازم)ەکە دەکەین (بدل)ەکە واز لیْ دەهێنین چونکە (لازمەکە) بەهێز ترە وەك:

(ءامّین) (ءآللهُ) (ءآلذَّكرين) (ءآلْـٰٔن)

وە ئەگەر (مد المتصل) و (مد البدل) پێکەوە کۆبوونەوە ئەو کاتە کار بە (مد المتصل) دەکریْ وەك (رئآء النّاس)

۱٥-مد العوض (درێژکردنەوەی لەجیاتی)

هەر کاتێك لەسەر وشەیەك وەستای کە کۆتاییەکەی تەنوین بوو، تەنوینەکەش منصوب بوو ئەو کاتە تەنوینەکە دەگۆڕیْ بۆ ئەلیف وە پێویستە ئەم ئەلیفەش بە قەد دوو حەرەکە درێژی بکەیتەوە، بەلاّم، ئەگەر لەسەری نەوەستای هەر بە تەنوین دەخوێنرێتەوە، یاخود ئەگەر لەسەر وشەیەك وەستای کۆتاییەکەی تای خری منْ بوو تەنوینی مەنصوبی هەبوو ئەو کاتە دەیکەی بە هایەکی سکوندار وەك (قريةً) لە کاتی وەستان لەسەری دەڵێی (قريَهْ) نموونە لەسەر (مد العوض)

| | | |
|---|---|---|
| افواجاً | لە کاتی وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە | (افواجا) |
| ماءً | لە کاتی وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە | (ماءا) |
| دعاءً | لە کاتی وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە | (دعاءا) |
| نداءً | لە کاتی وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە | (نداءا) |
| بناءً | لە کاتی وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە | (بناءا) |

### ١٦-مد اللين ( درێژكردنەوەی نەرم )

ئەمە لەو كاتەدا دەبێت كە یەكێك لە پیتەكانی (لین) كە بریتییە لە (وْ-يْ) زەنەیان لەدوا بێت زەنەكەش بەهۆی وەستان لەسەری پەیدا بووبێت وە پێویستیشە (وْ-يْ) واو و یائەكە خۆیان زەنەیان هەبێت وە پیتی پێشییان سەری هەبێت وەك:

(خَوْف- والصَّيْف-اثْنَيْن-ضَيْف-يَوْم-شَيْء- السوْء)

ئەم مەددە پێویستە بە قەد دوو یا چوار یا شەش حەرەكە پیتە مەددەكە درێژ بكرێتەوە، بەڵام باشترینییان دووەكەیە ئینجا چوارەكەیە ئینجا شەشەكە.

**تێبینی:**

ئەگەر قورئان خوێن پیتە مەددیەكەی لە (مد اللين) بە یەكێك لەو ژمارانە دەست پێ كرد (٢، ٤، ٦) ئەوە تا كۆتایی خوێندنەوەكەی هەر لەسەر ئەو ژمارە درێژكردنەوە دەڕوا، واتە لەسەر یەك لەم سێ ژمارە.

### ١٧- مد الفرق ( درێژكردنەوەی جیاوازی )

ئەمە بریتییە لەوەی كاتێك كە هەمزەی (إستفهام) واتە پرسیار كردن بچێتە سەر ناوێكی ناسراوی بە (الـ) ی ناسێنەر (تعریف) ئەم كاتە هەمزەكەی (ال)ی ناسێنەر دەبێتە ئەلیفێكی درێژكردنەوە و پێویستە بە قەد شەش حەرەكە درێژ بكرێتەوە ئەم مەددەش لە چوار شوێن هەیە لە قورئاندا.

١-﴿قُلْ ءالذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الأُنثَيَيْنِ﴾ سورەت الانعام ئایەتی (١٤٣).

٢-﴿ قُلْ ءالذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الأُنثَيَيْنِ﴾ سورەتی الانعام ئایەتی (١٤٤).

٣-﴿ قُلْ ءاللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ﴾ سورەتی یونس ئایەتی (٥٩).

٤-﴿ءاللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ سورەتی (نمل) ئایەتی (٥٩).

وە ئەوەش دەبێ هەمزەی دووەم بە نەرمی بخوێنرێتەوە واتە هەمزەی (إستفهام) بە دیاربێخی وە هەمزەی دووەم بە شێوەیەك بیخوێنی بکەوێتە نێوان هەمزە و ئەلیف.

### بەهێزترین درێژکردنەوە (مد)

بەهێزترین مەد (اللازم)ە چونکە (إجماع) هەیە لەسەر درێژکردنەوەی وە لەسەر ماوەی درێژکردنەوەی.
لەدوای (اللازم) (المتصل)ە چونکە (إجماع هەیە لەسەر درێژکردنەوەی نەك لەسەر ماوەی درێژکردنەوەی)
لەپاشان (العارض) لەپاشان (المنفصل) لە پاشان (البدل).
وە ئەگەر لەیەك هۆی درێژکردنەوە زیاتر لەسەر پیتێکی مەد کۆبوونەوە ئەو کاتە کار بە بەهێزترینییان دەکەین، بەڵام ئەگەر هۆیەکان یەکسان بوون ئەوە کار بە هەردووکیان دەکرێ.
وەك بە شیعر ئەمە گوتراوە دەڵێ:

*أقوى المدود لازم فما اتصل*     *فعارض فذوا إنفصال فبدل*
*وسـببا مد إذا ما وجـــدا*     *فإنّ أقوى السـببين انفردا*

# الألفاتُ السَّبْعِ فِي القُرآنِ الكَرِيْمِ

## ( حەوت ئەلیفەکان لە قورئاندا )

حەوت ئەلیف هەن لە قورئاندا لەکاتی وەستان لەسەریان دەخوێنرێنەوە بەڵام لەکاتی ڕۆیشتن لەسەریان ناخوێنرێنەوە کە ئەمانەن:

١-ئەلیفی (أنا) -ضمير المتكلم- لە هەموو قورئان وەك ﴿أنا أكثرُ منك مالاً وأعزُّ نفرا﴾ لە کاتی ڕۆیشتن لەسەری دەخوێنرێتەوە (أنْ) بەڵام لەکاتی راوەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە (أنا).

٢-ئەلیفی (لكنّا) لە فەرموودەی خوا ﴿لَكِنَّا هُوَ اللهُ رَبِّي﴾ (الكهف: ٣٨) واتە ئەگەر لەسەری وەستای بە(لكنّا) دەخوێنرێتەوە بەڵام ئەگەر لەسەری نەوەستای بە (لكنْ) دەخوێنرێتەوە.

٣-ئەلیفی (الظنونا) لە فەرموودەی خوا ﴿وتظنّون بالله الظنونا﴾ (الاحزاب: ١٠)

٤-ئەلیفی (الرسولا ) لە فەرموودەی خوا ﴿ وأطعنا الرسولا﴾ (الاحزاب: ٦٦).

٥-ئەلیفی (السبيلا) لە فەرموودەی خوا ﴿فأضلّونا السبيلا﴾ (الاحزاب: ٦٧).

٦-ئەلیفی ( قواريرا) لە فەرموودەی خوا ﴿كانتْ قواريرا﴾ (الانسان :١٥). بەڵام (قواريرا) لە ئایەتی (١٦)ی ئەم سورەتە لەسەری بوەستی یا نەوەستی ئەلیفەکەی ناخوێنرێتەوە، وە ئەگەر لەسەری بوەستی بە (قواريرْ ) دەخوێنرێتەوە، واتە بە سکون لەسەر (را)ی کۆتاییەکەی.

٧-ئەلیفی (سلاسلا) لە فەرموودەی خوا ﴿إنَّا أعْتَدْنا للكافرين سلاسلا وأغلالاً وسعيرا﴾ (الانسان:٤)

تەنها لەم وشەیەدا دەتوانی ئەگەر لەسەریشی وەستای ئەلیفەکە نەخوێنییەوە بڵێی (سلاسلْ).

# التفخيم والترقيق ( گەورە کردن و باریك کردن )

**١-التفخيم: گەورە کردن**

بریتییە لە گەورە کردنێك بەسەر پیتدا دێت سیفەتێکی زیادەیە

پیتە گەورەکراوەکان دوو بەشن:

أ-بەشێکییان بەگەورەیی دەخوێنرێنەوە بە بەردەوامی کە حەوت پیتەکەی (إستعلاء)ن (خُصَّ ضَغطٍ قظ).

ب-بەشێکییان هەندێ جار بە گەورەیی دەخوێنرێن هەندێ جاریش بە باریکی دەخوێنرێن کە (ل، ر، ا، غنە) ن.

<u>أ-پیتەکانی (إستعلاء) (احرف الاستعلاء)</u>

پیتەکانی (إستعلاء) بە بەردەوامی بەگەورەیی دەخوێنرێن ئەم گەورەکردنەش چەند باری هەیە:

١-گەورەترین حاڵەتی گەورە کردن لە پیتەکانی (إستعلاء) لەو کاتە دەبێ کە پیتەکە فەتحەی هەبێت و پیتی ئەلیفیشی لەدوا دا بێت وەك (قالوا- خالدين- للطائفين-الغائبين).

٢-لە پاشان ئەگەر پیتە (إستعلاء)ەکە فەتحەی هەبێت بەڵام ئەلیفی لەدوادا نەهاتبێ، واتە ئەمە کەمتر لەهی یەکەم گەورە دەکرێ وەك (ضرب-طبع-دخلوا).

٣-لە پاشان ئەگەر پیتەکە بۆری هەبێت وەك (ضُرِبَ- طوبى-قولوا).

٤-لە پاشان ئەگەر پیتە (إستعلاء)ەکە کەسری هەبێت کە ئەمەش نزمترین پلەکانی قەڵەوکردنە وەك (دَخلت-قِسْمَةً ضيزى).

٥-بەڵام ئەگەر پیتە (إستعلاء)ەکە سکوندار بێت ئەوە گەورە کردنەکەی بەجۆری حەرکەی پیتی پێشی دەبێت وەك (مطْلع) ئەوە گەورەکردنەکەی پیتی (ط) وەك حاڵی دووەمی رابردووە، وە

(مُقْحمَخُون) ئەوە گەورەكردنی (ق) وەكو خاڵی سێیەمی رابردووە
وە (إخْراج) گەورەكردنی پیتی (خ) وەكو خاڵی چوارەمە.

ب: ئەو پیتانەی هەندێ جار گەورە دەكرێن هەندێ جار گچكە و باریك.

یەكەم: پیتی لامی (الله) ئەمە لە (احكام اللام)دا باس كراوە.
دووەم: پیتی (را) ئەمەش لە (احكام الراء) باس كراوە.

### سێیەم: پیتی (ئەلیف)

پیتی (ئەلیف) گەورە دەكرێ ئەگەر لە دوای پیتی گەورەكراو هات وە سادە و باریك دەخوێنرێتەوە ئەگەر لەدوا پیتی سادە و باریك هات.

ا- گەورە دەكرێ ئەگەر لەدوای پیتەكانی (إستعلاء) هات.

ب- وە هەروەها قەڵەو دەكرێ ئەگەر لە دوای پیتی لامی (الله) هات بە مەرجێك پێشی لامەكە (كسْ) نەبێت واتە ژێردار.

ج- وەهەروەها (ئەلیف) قەڵەو دەكرێ كاتێك كە لەدوای (را)ی گەورەكراو هات بەڵام (را)یەكەی رای (ممالە) نەبێت.

د- ئیتر پیتی (ئەلیف) لە هەموو شوێنەكانی تر بە باریكی و سادەیی دەخوێنرێتەوە.

نموونە لەسەر ئەلیفی گەورەكراو:

(الظالمِین- قال اللهُ -ولو ترى)

چوارەم : مینگە (غُنّة ) : غوننە گەورە دەكرێ كاتێك كە نون یا تەنوین (إخفاء ) دەكرێن پیتی (إستعلا )یان لە دوا دێت وەك:

(ینصرون- من صیام- من ضَعْفٍ- مَنْضُود- من طینٍ- ینقلبون- من ظلم- مُسْفِرةٌ ضاحِكةٌ ).

مینگە (غنة ) بێجگە لەوەی سەروو لە حاڵەتەكانی تر لاواز و باریك و گچكە دەكرێ وەك (كُنتم- انفقْتُم).

# ( إدغام المتماثلين و المتجانسين و المتقاربين )

## ١-( إدغام المتماثلين ) تێهەڵكێشانی هاو وێنە

ئەمە بریتییە لە بە یەك گەیشتنی دوو پیت كە یەكەمییان سكوندارە وە هەردوو پیت لە سیفەت و جێگە دەرچوون وەك یەكن، ئەم كاتە پیتی یەكەم دەغم دەكرێ لەگەڵ پیتی دووەم دەبێتە یەك پیتی شەددەدار وەك :

| | | |
|---|---|---|
| رَبِحَتْ تِّجَارَتُهُمْ | دەخوێنرێتەوە | رَبِحَتِّجَارَتُهُم |
| إضْرِبْ بِعَصَاكَ | دەخوێنرێتەوە | إضْرِبّعَصَاكَ |
| إذْ ذَهَبَ | دەخوێنرێتەوە | إذّهَبَ |
| وَقَدْ دَخَلُوا | دەخوێنرێتەوە | وَقَدّخَلُوا |
| يُدرِكْكُم الموت | دەخوێنرێتەوە | يُدرِكُّمُ الموت |
| قُلْ لا اقولُ | دەخوێنرێتەوە | قُلّاقولُ |
| فلا يسرفْ في القتل | دەخوێنرێتەوە | فلايُسْرِفّي القتل |
| عَفَوا[1] وَقالوا | دەخوێنرێتەوە | |
| جاءَتكُم موعظةٌ | دەخوێنرێتەوە | |
| يُكرِهْهُنَّ | دەخوێنرێتەوە | |
| لَنْ نَصبِرَ | دەخوێنرێتەوە | |
| واذكُرْ رَبَّكَ | دەخوێنرێتەوە | |

(١) عفوا: وارەكەی واوی مەددی نیە بۆیە دەغم دەكرێ لەگەڵ واوی (وقالوا)

**تێبینی:**

أ- لە وتەی خودا ﴿مَالِيَهْ * هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ﴾ سورەتی الحاقە دەتوانی های (مالیە) دەغم بکرێ لەگەڵ های (هلك) دەشتوانی دەغمییان نەکەی، ئەگەر دەغمت نەکردن ئەو کاتە کەمێك بێ نەفەس خواردنەوە لەسەر (مالیە) دەوەستی ئەوجا بەردەوام دەبیت لەسەر خوێندنەوە.

ب- نابێ واوی مەددی ئەگەر واوی لەدوا هات یا یائی مەددی ئەگەر یائی لەدوا هات دەغم بکرێن وەك (آمنوا وعملوا ) وە (الذي يوسوس ) چونکە مەخرەجییان وەك یەك نییە.

### ٢-( إدغام المتجانسين ) تێکهەڵکێشانی هاورەگەز

ئەم جۆرە دەغمە بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیت یەکەمیان زەنەدار، هەردوو پیت لە یەك جێگە (مخرج) دەردەچن، بەڵام سیفەتییان وەك یەك نییە، ئەو کاتە پیتی یەکەم دەغم دەکرێ لەگەڵ پیتی دووەم دەکرێنە یەك پیتی شەددەدار لە جۆری پیتی دووەم ئەم جۆرە دەغمەش لە بەیەك گەیشتنی ئەم پیتانە ڕوودەدات جا لەیەك وشەدا بوون یا لە دوو وشە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١- | تْ+ط | ← | وَدَّتْ طَائِفَةٌ | دەخوێنرێتەوە | وَدَّطَّائِفَةٌ |
| ٢- | طْ+ت[1] | ← | أحَطْتُ | دەخوێنرێتەوە | أحَتُّ |
| ٣- | تْ+د | ← | أثْقَلَتْ دَعَوَا | دەخوێنرێتەوە | أثْقَلَدَّعَوَا |

(١) ط+ت: ئەم تێکهەڵکێشانە تێکهەڵکێشانی ناتەواو (ناقص)ە چونکە (ط) دەڕوات بەڵام سیفەتەکەی دەمێنێ کە بەرزکردنەوەی کۆتایی زمانە (الأطباق)، کۆتایی زمان بەرزدەکرێتەوە دەتەوێ (ط) بڵێی بەڵام نایڵێی دەغمی دەکەی لەگەڵ (ت) (ط+ت) يكون الادغام في هاتين الكلمتين إدغاماً ناقصاً لذهاب (الطاء) وبقاء صفتها وهي (الأطباق).

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤- | دْ+ت | ← | قد تبيَّن | دەخوێنرێتەوە | قَتَّبيَّنَ |
| ٥- | ذْ+ظ | ← | إذ ظلمتُم | دەخوێنرێتەوە | إظّلمتُم |
| ٦- | ثْ+ذ | ← | يلهث ذلك | دەخوێنرێتەوە | يلْهذّلك |
| ٧ | بْ+م | ← | إركب معنا | دەخوێنرێتەوە | اركمّعنا |

## ٢-( إدغام المتقاربين ) تێکهەڵکێشانی لێك نزیك

ئەمە بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیت، پیتی یەکەمیان زەنەدارە ئەم دوو پیتە جێگە دەرچوون و سیفەتیان لێك نزیکە، ئەو کاتە پیتی یەکەم دەغم دەکرێ لەگەڵ پیتی دووەم دەکرێنە یەك پیتی شەددەدار لە جۆری پیتی دووەم ئەم دەغمەش لە دوو شوێن روودەدات کە ئەم دووحاڵەتەیە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١- | لْ+ ر | ← | وقُلْ ربِّ | دەخوێنرێتەوە | وقُرَّبِّ |
| | | | بلْ رفعَهُ | دەخوێنرێتەوە | بَرَّفَعَهُ |
| ٢- | قْ+ك | ← | الَمْ نَخْلُقْكُمْ | دەخوێنرێتەوە | الَمْ نَخْلُكُّمْ |

(حفص): (الم نخلقكم) بە إدغامی کامل دەیخوێنێتەوە.

# هەمزەی ئەصلی و هەمزەی وەسڵ ( وصل )

**١-هەمزەی ئەسڵی یا هەمزەی ( قطع ):**

ئەو هەمزەیە لە وشەدا ئەگەر لێی بپچڕێنی (قطع )بکەی کاریگەری لەسەر وشەکە هەبێت وەك ناوی (أحمد) ئەگەر هەمزەکەی لابەی دەبێتە (حمد) مانای وشەکە دەگۆڕێ، جا هەمزەی ئەسڵی لە سەرەتای خوێندنەوە دا بوو یا کەوتە ناوەندەکان یا لە سەری وەستان دەبێ بخوێنرێتەوە و (حذف )نەکرێ وەك:

(اسمه أحمد، إنّ إلياس، فأراد، يؤمنون، يشاء )

**٢-هەمزەی وەسڵ ( وصل ):**

ئەو هەمزەیە ئەگەر لەسەرەتاوە دەستت پێ کرد دەخوێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ وشەیەك لێکت دا هەمزەکە نامێنێ و (حذف ) دەکرێ وە نیشانەشی لە (مصحف)دا صادێکی گچکەیە لەسەر ئەلیفەکە کراوە.

جا هەمزەی وەسڵ (وصل) لە پیت و ناو و فیعل دا هەیە

ا-هەمزەی وسڵ (وصل) لە پیت دا تەنها دەچێتە سەر (ل)ی ناسێنەر (تعريف)، ئەمەش گوتمان لە سەرەتای خوێندنەوە بوو هەمزەکە دەخوێندرێتەوە و فەتحەداریش دەبێت، بەڵام ئەگەر هەمزەکە لەگەڵ وشەیەك لێك درابوو ناخوێنرێتەوە وەك (الحاقّة ① ما الحاقّة ② ).

ب-هەمزەی وەسڵ (وصل) لە ناو (اسم) دا ئەگەر کەوتە سەرەتای خوێندنەوە کەسرەدار دەکرێت وە ئەگەر کەوتە نێوانەکان و لەکاتی (وصل) نامێنێ و (حذف) دەکرێ وەك (استغفار-امرأة-استكباراً ).

وە نموونەش لەسەر حاڵەتی (وصل) وەك:

١- ﴿مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ -تقرا وصلاً- (من بعدِ سْمُهُ احمد).

٢- ﴿عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ -تقرا وصلاً - (عيس بْنُ مريم).

٣- ﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ﴾ -تقرا وصلاً- (ومريم بْنَتَ عمران).

٤- ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ﴾ -تقرا وصلاً - (إنِ مْرُؤٌ هلك).

٥-﴿قَالَتِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ﴾ -تقرا وصلاً -(قالتِ مْرَاتُ العزيز).

٦-﴿حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ﴾ -تقرا وصلاً- (حينَ الوصيةِ ثْنَان).

٧-﴿لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ - تقرا وصلاً - ( لا تتخذوا إلهين ثْنين).

٨-﴿مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ﴾ -تقرا وصلاً - (منهُ ثْنَتا عشرة).

٩- ﴿فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ﴾ -تقرا وصلاً - (فإن كانتَ ثْنتين).

وە بەردەوامیش هەمزەی (وصل) لە ناودا ئەگەر دەستت بە خوێندنەوەی ئەو کرد بە زێدار دەخوێنرێتەوە.

**تێبینی:**

وشەی (امرؤٌ ) حەرەکەی پیتی (ر)یەکەی وەکو حەرەکەی ئەو پیتە دەبێت کە لە دوای دێت وە ئەگەر بە ئەو دەستی پێ کرا واتە بە (إمرؤٌ ) هەمزەکەی زێدار دەبێت وەك:

(إمْرأ سوءٍ - إنِ امْرُؤٌا هلك - لِكُلِّ امْرِيءٍ منهم )

ج- هەمزەی وسڵ (وصل) لە (فعل)دا ، هەر وەك گوتمان هەمزەی فیعل ئەگەر بە ئەو دەست پێ کرا دەخوێنرێتەوە ئەگەر لەگەڵ وشەیەکدا لێکت دا هەمزەکە نامێنێ و (حذف ) دەکرێ.

جا هەمزەی وەسڵ (وصل) لە فیعل دا ئەگەر فیعلەکە سێیەم پیتی بۆر (ضـمة ) بوو هەمزەکەی لە سەرەتای خوێندنەوە بە بۆر (ضـمة ) دەخوێنرێتەوە وەك (اُخْرُجْ، اُدْخُلُوا، اُضْطُرَّ )

تەنها لەم وشانەدا نەبێت کە پیتی سێیەمی بۆر (ضـمة )یەکی نووشهاتووی هەیە وەك (اِئْتُوا، اِئْتُونِي، اِمْشُوا، اِبْنُوا، اِمْضُوا، اِقْضُوا )

ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە بۆر (ضمة )ی پیتی سێیەمەکە تووشی هاتووە بە هۆی واوی (جماعة ) دەنا خۆی لە بنەڕەتدا بۆر نییە.

وە بۆ زانین ئەم دوو وشەیە (ائْتُوا، ائْتُونِي ) ئەگەر لە سەرەتاوە دەستت کرد بە خوێندنەوەی بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە (إِيتُوا، إِيتُونِي ) چونکە دەکەونە بابی (مد البدل).

وە هەمزەی (فعل) لە هەموو بارەکانی تر کە لە سەرەتاوە دەستی پێ کراوە بە ژێر (کسرة ) دەخوێندرێتەوە واتە پیتی سێیەمی فەتحەدار یا کسرەدار بێت.

وەك (إِقْرَأ، إِضْرِب، إِختَلَفَ، إِقتَتَل، إِبتِغاء )

**تێبینی:**

ئەگەر پێش هەمزەی (وصل) حەرفێکی سکوندار هەبوو ئەمە سێ حاڵەتی بۆ دەبێت سەر یا بۆر یا ژێر.

ا-ئەگەر هەمزەی (وصل) (مِن)ی لە پێشدا هات ئەوە نونەکە فەتحەدار دەکرێ وەك (فَمِنَ الله) (مِنَ الجِنَّة والنّاس).

ب-ئەگەر میمی (جمع) یا (واو) ی جمع کە سکونی هەیە پێش واوە سکوندارەکەش فەتحە هەیە لە پێش، هەمزەی (وصل) بوو ئەو کاتە (میم)ەکە یا (واو)ەکە بە بۆر (ضمة ) دەخوێنرێن وەك (عليكمُ الصيام) (ءاتَوُا الزكاة ) (إشترَوُا الضلالة ).

ج-جگە لەم دوو حاڵەتە پیتی سکونداری پێش هەمزەی وەسڵ ژێر (کسر) وەردەگرێ وەك:

(أنِ اضْرِب) (وقالتِ اخْرُجْ) (أنِ امشوا) ( أنِ اصنَعِ الفُلْكَ).

د-ئەگەر تەنوین پێش هەمزەی وەسڵ کەوت تەنوینەکە دەبێتە نونێکی ژێردار وەك:

﴿أحدٌ * اللهُ الصَّمَدُ﴾ دەخوێنرێتەوە (أحَدُنِ اللهُ الصَّمَد)

﴿مَحْظُوراً* انظُرْ ﴾ دەخوێنرێتەوە (مَحْظُورَنِ نظر)

﴿وَعَذابٌ* ارْكُضْ﴾ دەخوێنرێتەوە ( وَعذابُنِرْكُضْ)

# ( الكلمات السبع ) حەوت وشەکان

ئەگەر هەمزەی پرسیار کردن (إستفهام) کۆبووە لەگەڵ هەمزەی وەسڵ (وصل) لە وشەیەکدا پێویستە هەمزەی وەسڵ (وصل)ەکە (حذف ) بکرێ، ئەمەش لە حەوت وشە هاتووە لە قورئان:

١-﴿قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ اللَّهِ عَهْدًا﴾ سورة البقرة (٨٦).

٢-﴿أَطَّلَعَ الْغَيْبَ﴾ سورة مريم (٨٧).

٣-﴿أَصْطَفَى الْبَنَاتِ﴾ سورة الصافات (١٥٣).

٤-﴿أَفْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ سورة سبأ( ٨).

٥-﴿أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا﴾ سورة ص (٦٣).

٦-﴿أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ﴾ سورة ص (٧٥).

٧-﴿أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ سورة المنافقون (٦)

جا ئەسڵ لەم وشانە بەم شێوەیە:

(إتخذتم- إطلع- إصطفى-إفترى-إتخذناهم-إستكبرت-إستغفرت )

### کۆبونەوەی هەمزەی وەسڵ ( وصل ) و ئەسڵی: أصل )

ئەگەر هەمزەی ئەسڵی سکوندار لە سەرەتای خوێندنەوە هات لە دوای هەمزەی وەسڵ (وصل) ئەو کاتە هەمزە ئەسڵییە سکوندارەکە دەگۆڕێ دەبێتە پیتێکی مەددی لە شێوەی حەرەکەی هەمزەی (وصل) بۆ نموونە ئەگەر هەمزەی (وصل) بۆر (ضمة )ی هەبوو هەمزە ئەسڵییە سکوندارەکە دەبێتە واوێکی مەددی وەك:

١-﴿الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ (البقرة:٢٨٣) ← اؤْتُمِنَ← أُوتُمِنَ امانته.

٢-﴿يَقُولُ ائْذَن لِّي﴾ (التوبة: ٤٩) ← إئْذَنْ لي← إيذَن لِي.

٣-﴿ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ﴾ (يونس: ١٥) ← إئت بقرءانٍ ← إيت بقرءانٍ

٤-﴿يَا صَالِحُ ائْتِنَا﴾ (الأعراف: ٧٧) ← إئْتنا بما ← إيتنا بما.

٥-﴿فِي السَّمَاوَاتِ ائْتُونِي﴾ (الأحقاف: ٤) ← إئْتوني← إيتُوني.

# الوقف والإبتداء

**الوقف: وەستان:** (هو قطع الصوت على كلمة قرآنية بزمن يتنفس فيه عادة بنية إستئناف القراءة)

واتە: (الوقف) بریتییە لە دەنگ پچڕاندن و بێ دەنگ بوون لەسەر وشەیەکی قورئانی بۆ ماوەیەك عادەتەن هەناسەدانی لەگەڵ دا دەبێت بە مەبەستی بەردەوام بوون لەسەر خوێندنەوەکە.

بەڵام (القطع)

(هو قطع الصوت على كلمة قرآنية بنية الأعراض عن القراءة و محله رؤوس الآية)

واتە: (القطع) بریتییە لە پچڕاندنی دەنگ لەسەر وشەیەکی قورئانی بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە خوێندنەوە، وە شوێنەکەشی سەری ئایەتەکانە.

جا (الوقف) وەستان دەبێتە سێ بەش:

١-الوقف الإضطراري.

٢-الوقف الإختباري.

٣-الوقف الإختياري.

## ١-الوقف الإضطراري: وەستانی ناچاری

ئەم وەستانە ئەم کاتە ڕوودەدات کە قورئانخوێن نەفەسی نامێنێ یا وەکو کۆخەی بۆ دێت یا پشمێ یا گریان، یا هەر شتێك کە ناچاری بکات رابوەستێت، ئەم جۆرە وەستانە جائزە، جا ئەگەر وەستانە ناچارییەکەی لە شوێنێك بوو کە وەستانی جائز نەبوو ئەو کاتە کە دەستی کردووە بە خوێندنەوە کەمێك دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بە قەد ئەوەی کە ماناکەی داوای دەکات.

## ٢- (الوقف الإختياري ) وەستانی تاقی کردنەوە:

ئەم جۆرە وەستانە بۆ کاتی فێربوونی قورئان خوێندن، یا تەفسیر کردنی ئایەت و وشەکانە، ئەم جۆرە وەستانەش جائزە لەسەر هەر وشەیەك بێت.

## ٣-(الوقف الإختياري ) وەستانی خۆویست

ئەمە ئەو وەستانێك دەوترێ کە خوێنەر بە ویستی خۆی لەسەر وشەیەك بوەستێ، واتە لەبەر ئەو دوو هۆیەی پێشوو نەبێت، ئەم جۆرە وەستانەش دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش کە ئەمانەن:

أ-(الوقف التامْ ) وەستانی تەواو

ئەم وەستانە جوانە لەسەری بوەستی ئینجا دەستکردن بە خوێندنەوەی ئەوەی لە دوای دێت.

ئەم وەستانە بریتییە لە وەستان لەسەر وشەیەك کە قسە لەوێ تەواو دەبێ بە قسە و بە واتا ئەوەی کە لە دوای دێت پەیوەندی بە ئەو و ئەوەی کە لە پێش ئەویشدا نەبێت نە بە قسە (إعراب) و نە بە واتا.

وەك ئەم چوار شوێنە لە سەرەتاکانی سورەتی (البقرة ):

١-﴿المفلحون ﴾ ئایەتی (٥) لێرە باس لە بڕواداران تەواو دەبێت.

٢-﴿ولَهمْ عذابٌ عظيمٌ﴾ ئایەتی (٧) ئەمە لە باسی کافرانە ئەوەی لە دوای دێت باسی مونافیقانە.

٣-﴿إنَّ اللّه على كُلِّ شيْءٍ قديرٌ﴾ئایەتی (٢٠) ئەوەی لە دوای دێت باسێکی ترە.

٤-﴿وهُوَ بكُلِّ شيْءٍ عليم﴾ ئایەتی (٢٩) ئەوەی لە دوای دێت باسێکی ترە.

یا وەستان لەسەر ﴿الْحمْدُ للّه ربِّ الْعالمين﴾

## ب- وەستانی كیفایەت (الوقف الكافي)

ئەم وەستانەش (جائز)ە: بریتییە لە وەستان لەسەر وشەیەك تا ئەوێ ماناكەی تەواو بێت ئەوەی كە لە دوایەوە دێت بە مانا پەیوەندی پێیەوە هەبێت نەك بە قسە (الوقف الكافي: هو الوقف على مقطع تم معناه وتعلق ما بعده به معناً لا لفظاً ) وەك وەستان لەسەر ئەم شوێنانە كە هەموویان لەسەرەتاكانی سورەتی (البقرة )ن :

١-﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ئایەتی (٦).

٢-﴿وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ﴾ ئایەتی (٨).

٣-﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ ئایەتی (١٠).

٤-﴿وَلَكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾ ئایەتی (١٢).

## ج- (الوقف الحسن) وەستانی باش

ئەم وستانەش دروستە (جائزە)، بریتییە لە وەستان لەسەر بەشێك كە واتا بەخشە، بەڵام باشترە بیگەیەنی بە دوای خۆییەوە، چونكە ئەوەی دوای خۆی هەم بە قسە هەم بە واتا پەیوەندی پێیەوە هەیە، گوتمان بەشی یەكەم واتا بەخشە، بەڵام بەشی دووەمی جوان نییە لەوێ دەست بكرێتەوە بە خوێندن بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ شوێنێك لە پێشەوە كە دروست بێت لەوێ دەست پێ بكەیەوە ئەمەش ئەگەر لەسەرە ئایەت بوو. وەك وەستان لەسەر (الحمد لله) لە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾

جا وەستان لەسەر (الحمد لله) باشە دروستە بەڵام باشتر وایە بیگەیەنی بە (رَبِّ الْعَالَمِينَ) وە كە لەسەر (الحمد لله) وەستای كە دەستت بە خوێندن كردەوە لە (رَبِّ الْعَالَمِينَ) دەست پێ ناكەی بەڵكو (الحمد لله) لەگەڵی دەڵێی.

## د-(الوقف القبيح) وەستانی ناشیرین

ئەم وەستانەیە کە مانا تێدا بەدەستەوە وەکو ئەوە لەسەر (مُبتدا ) بوەستی بەبێ خەبەرەکەی، یا لەسەر (فعل ) بوەستی بەبێ (فاعل) یا لەسەر (فاعل) بوەستی بەبێ (مفعول) یا لەسەر (شرط ) بەبێ وەڵامەکەی یا لەسەر (الحروف المشبه بالفعل) وەك (إنَّ-لكنَّ)بوەستی بەبێ (إسم) و (خبر) یا لەسەر (الفعل الناقص) وەك (کان -لیس) بوەستی بەبێ (إسم) و (خبر) یان

وەك:

١-لەسەر (قال) بوەستی لە (قال الله)- (قال: فعل ماضي، الله: لفظ الجلالة فاعل)

٢-لەسەر (محمد) بوەستی لە (محمد رسول الله).

٣-لەسەر (وكان) بوەستی لە (وكان الله).

٤-لەسەر (يفعل) بوەستی لە (ومَن يفعل ذلك يلق اثاماً)

## هـ- (الوقف الاقبح من قبيح) وەستانی زۆر ناشیرین

ئەم جۆرە وەستانە حەرامە تەنها ئەگەر لەبەر ناچاری وەستای وە ئەگەر یەکێك هەر بڕوای وابێت ئەوە کافر دەبێت وەك وەستان لەسەر:

١-﴿إنَّ الله لا يستحي﴾.

٢-﴿يا أيها الذين ءامنوا لا تقربوا الصلاة﴾.

٣-﴿يدخل من يشاء في رحمته والظالمين﴾.

٤-﴿إنَّ الله فقير﴾

٥-﴿ إني كفرت﴾

٦-﴿انا الله﴾.

٧-﴿ لا إله﴾.

٨-﴿إنَّ الله لا يهدي﴾.

بەڵام جائزە لەسەر کۆتایی ئایەت بوەستێ لە (وەستانی زۆر ناشیرین) بە مەرجێك بەردەوام بێت لەسەر خوێندنەوەی وەك لەسەر (فویل للمصلین) بوەستێ و ئینجا بەردەوام بێت لەسەر خوێندنەوەکە.
لەکۆتاییدا دەڵێم (لیس في القرآن وقف واجب یأثم القارئ بترکه ولا حرام یأثم به إلا أن یکون له سبب یقتضي التحریم، وکأن یتعمد الوقف علی (ما من إله) فان قصد المعنی کفر).
واتە: لە قورئاندا هیچ وەستانێکی واجب نییە کە ئەگەر قورئانخوێن نەوەستا گوناهبار بێت، یا حەرام بێت ئەگەر وەستا پێی گوناهبار بێت تەنها ئەگەر هۆیەکی هەبێت بەم هۆیەوە حەرام بێت وەکو بە ئەنقەست لەسەر (ما من إله) بوەستێ جا ئەگەر مانایەکەی مەبەست بوو پێی کافر دەبێت.

## روون کردنەوەی زیاتر

خوێنەری قورئان هەر چەندە زیاتر شارەزای ڕێزمان و فەرهەنگی زمانی عەرەبی بێت زیاتر دەتوانێ شارەزای خوێندن و تەجویدی قورئان بێت، بۆ نموونە وەك ئەم زانیارییە دەربارەی وەستان (وقف) کە دەڵێ:

١-لایوقف علی الفعل دون فاعله.
٢-ولا علی الفاعل دون المفعول به.
٣-ولا علی حرف الجر دون الإسم المجرور.
٤-ولا علی المضاف دون المضاف إلیه.
٥-ولا علی المبتدا دون خبره.
٦-ولا علی الموصوف دون صفته.
٧-ولا علی المعطوف علیه دون المعطوف.
٨-ولا علی صاحب الحال دون الحال.
٩-ولا علی العدد دون المعدود.

١٠-ولا على المؤكد دون التوكيد.

جا ئەگەر قورئانخوێن نەزانێ (فعل) چییە، نەزانێ (فاعل) چییە، نەزانێ (مفعول بە) چییە، نەزانێ (حرف جر) چییە، نەزانێ (إسم مجرور) چییە، بابەتێکی وا چۆن تێ دەگات و جێبەجێ دەکات لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا.

# (الإبتداء) دەست پێ کردن

دەبێ قورئانخوێن چۆن کاتێک کە دەوەستێ لە شوێنێکی گونجاو دەوەستێ ئەوەهاش هەوڵ بدات کاتێک کە دەست بە قورئان خوێندن دەکات لە شوێنێکی گونجاو دەست پێ بکات جا (الإبتداء) دەست پێ کردن دوو جۆرە: دروست و قەدەغە (جائز و ممنوع)

*(الإبتداء الجائز) دەبێتە دوو بەش:*

١-(الإبتداء التام): ئەم جۆرە دەست پێ کردنە، دەست پێ کردنە بە بەشێک کە پەیوەندی نییە بە پێش خۆی نە لە رووی (أعراب) نە لە رووی مانا وەک دەست پێ کردن بە سەرەتای سورەتەکان یا بە سەرەتای چیرۆکەکان (كذبت ثمودُ المرسلين)

یا یەکەم باسی بە هەشت یا یەکەم باسی ئاگر، یا یەکەم باسی سیفاتی ئیمانداران یا مونافیقان.

٢-(الإبتداء الكافي): ئەمە دەست پێ کردنە بە وشەیەکی قورئان کە پەیوەندی بە پێش خۆییەوە هەیە لە رووی ماناوە نەک لە رووی (لفظي) (أعراب)وە وەک دەست پێ کردن بە:

١-﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾.

٢-﴿يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ﴾

٣-﴿وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾.

٤-﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِن لاَّ يَعْلَمُونَ﴾

*وە (الإبتداء الممنوع) دەبێتە دوو بەش:*

١-(الإبتداء القبيح): ئەم جۆرە دەست پێ کردنە بە بەشێک کە مانا نادات

وەك دەست پێ کردن بە (فاعل) بە بێ (فعل)ەکەی وەك دەست پێ کردن بە (نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي) لە فەرموودەی خوا کە دەفەرمووێ ﴿قَالَ نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي﴾

یا دەست پێ بکەی بە (مفعول) بەبێ (فاعل)ەکەی یا بە (صفة) بەبێ (موصوف)ەکە یا بە (توکید) بەبێ (مؤکد)ەکەی یا (مضاف إلیه) بەبێ (مضاف)ەکەی

٢-(الإبتداء الأقبح من القبیح): ئەمە دەست پێ کردنە بە بەشێك کە مانایەکی پێچەوانە بدا بە دەستەوە وەك دەست پێ کردن بە (اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا) لە فەرموودەی خوا کە دەفەرمووێ ﴿قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا﴾

بەڵام هیچی تیادا نییە و دروستە خوێنەر دەست پێ بکات بە سەری ئایەت جا هەر مانایەك بدات وەك ﴿الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ یا ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾

*ئەگەر (وقف) (تام) بوو دەست پێ کردن بە دوای ئەو (تام)ە وە ئەگەر وەقف (کافی) بوو دەست پێ کردن (الإبتداء) بە دوای ئەو (کافی)یە وە ئەگەر (وقف) (حسن) بوو دەست پێ کردن بە دوای ئەو (قبیح)ە بە مەرجێك ئەگەر سەری ئایەت نەبوو.

وە ئەگەر (وقف) لەکۆتایی ئایەت بوو، دەست پێ کردن بە دوای ئەو دروست (جائز)ە.

# شوێنەواری وەستان (آثار الوقف) و وەستان

١-ئەگەر لەسەر وشەیەك وەستای كە كۆتاییەكەی بۆر یا سەر یا ژێری هەبوو ئەوە حەرەكەكان دەكرێن بە زەنە (سكون) لە كاتی وەستان لەسەرییان.

٢-ئەگەر لەسەر وشەیەك وەستای كۆتاییەكەی تەنوینی (مرفوع) یا (مجرور) بوو دەكرێن بە سكون وەك (كتابٌ) (سماءٍ) لە كاتی وەستان لەسەرییان دەخوێنرێنەوە (كتابْ) (سماءْ)

بەڵام ئەگەر لەسەر وشەیەك وەستای تەنوینی (منصوب)ی هەبوو ئەو كاتە لە شوێنی تەنوینەكە ئەلیفێك دادەنرێ ئەم ئەلیفەش بە قەد دوو حەرەكە درێژ دەكرێتەوە، بە مەرجێك تەنوینەكە لەسەر (تای) خڕی مێ نەبێت ئەگەر لەسەر تای مێی خڕ بوو ئەو كاتە تایەكە دەكرێتە هایەكی سكوندار وەك:

(بناءً) لە دوای وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە (بناءا).

(ماءً) لە دوای وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە (ماءا).

(ونساءً) لە دوای وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە (ونساءا).

(حسيباً) لە دوای وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە (حسيبا).

(قريةً) لە دوای وەستان لەسەری دەخوێنرێتەوە (قريهْ).

٣-ئەگەر كۆتایی وشەكە پیتێكی درێژكردنەوە بوو پێویستە لەكاتی وەستان لەسەری بیخوێنیتەوە بە قەد دوو حەرەكەش درێژی بكەیتەوە وەك:

١-(﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى﴾.

٢-﴿فَادْخُلِي فِي عِبَادِي * وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾.

٣-﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى﴾.

٤-تای مێی خڕو کراوە

ئەو تاانەنە کە بە کۆتایی ناو لکێنراوە نیشانەیە لەسەر ئەوە کە ئەو ناوە مێیە، جا ئەگەر بە شێوەی خڕ بوو لەکاتی گەیاندن (وصل) بە (تاء) دەخوێنرێتەوە و بەڵام لە کاتی وەستان لەسەری بە (هاء)ێکی سکوندار دەخوێنرێتەوە وەك (رحمة ربِّكَ- نِعْمَةَ- امْرأةٌ)

لەکاتی وەستان لەسەرییان بەم شێوە دەخوێنرێنەوە (رحمهْ - نعمهْ - امراه)

بەڵام کاتێك کە هەندێك لە (تا)ی مێ بە شێوەی کراوە دەنوسرێت ئەوە کاتێك کە لەسەری دەوەستی بە (تا)یێکی کراوەی سکوندار دەخوێنرێتەوە.

وەك (فِطرَتَ اللهِ- و رحمتُ ربِّكَ - نِعمتَ الله - إمرأتُ عمْران)

لەکاتی وەستان لەسەریان بەم شێوە دەخوێنرێنەوە (فِطرتْ- ورحمتْ- نعمتْ- امرأتْ)

## (علامات الوقف في المصاحف)

## نیشانەکانی وەستان لە قورئانەکان

م-الوقف اللازم - وەستانی پێویست.

لا-الوقف الممنوع- قەدەغە بوونی وەستانە.

ج-الوقف الجائز -وەستان و نەوەستان وەکو یەکە.

صلی-الوقف اولی- گەیاندن باشترە، هەرچەندە وەستانیش دروستە.

قلی-الوقف اولی- وستان باشترە، هەرچەندە نەوەستانیش دروستە.

ط- الوقف المطلق- وەستانی بێ سنوور، ئەتوانی نەوەستی بەلام وەستان باشترە.

ز-وەستان و نەوەستان دروستە بەلام نەوەستان باشترە.

ص-نیشانەی وەستانی دروستە بۆ کاتی ناچاری.

ق-فەرمانە بە وەستان (علی الإستحباب) بەلام ئەگەر نەوەستاش هیچی تێدا نییە (امر بالوقوف علی الإستحباب، وان وصل فلا بأس)

(∴ ∴) - ئەم دوو سێ خاڵە نیشانەی ئەوەیە ئەگەر لەسەر یەکێکییان وەستای لەسەر ئەوی تر ناوەستی، ئەگەر لەسەر ئی دووەم وەستای لەسەر ئی یەکەم ناوەستی وەك ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾

س-نیشانەی سەکتەیە وەستانێکی کەم بەبێ هەناسەدان بە قەد دوو حەرەکە بۆ ئەمە سەر لە (السکتات في القرآن) بدە.

# چەند روونكردنەوەیەك

١-(وَيَبۡصُۜطُ) لە سورەتی (بقرة) ئایەتی (٢٤٥) وە (بصۜطة) لە سورەتی (أعراف) ئایەتی (٦٩) دوو صادەكانییان بە (س) دەخوێنرێنەوە.

وە (المصیطرون) لە سورەتی (طور) بە (صاد) نووسراوە بەڵام بە (سین و صاد) دەخوێنرێتەوە، وە (بمصیطر) لەسورەتی (غاشیە) بە بە(صاد) نوسراوە وەهەر بە(صاد)یش دەخوێنرێتەوە.

٢-لە سورەتی (الروم) ئایەتی (٥٤) دەتوانی پیتی ضادەكان بە بۆر (ضمة) یا بە سەر (فتحة) بخوێنی

خــوا دەفــەرمووێ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ ضَعۡفًا وَشَيۡبَةً يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ﴾(الروم:٥٤)

٣-لە سورەتی (نحل) ئایەتی (٣٦) (فما ءاتان الله) دەتوانی كاتێك لەسەر وشەی (ءاتان) راوەستای بێ (یا) بیخوێنی بەم جۆرە (فماءاتان) وە دەشتوانی بە (یا) نیش بیخوێنی بەم جۆرە(فما ءاتاني) بەڵام ئەگەر لەسەری نەوەستای دەبێ لەگەڵ (یا) بیخوێنی بەم جۆرە (فما ءاتاني الله)

٤-(الإمالة) بریتی لە خوێندنەوەی ئەلیفی (مَجۡرٜىٰهَا) لە سورەتی هود ئەلیفی یەكەم بە شێوەیەك كە بكەوێتە نێوانی ئەلیف و یا (والله اعلم) وەكو (ێ)ی زمانی كوردی دەخوێنرێتەوە، وە (را)یەكەشی بە لاوازی دەخوێنرێتەوە، لە ریوایەتی (حفص) (امالة) تەنها لەم وشەدا هەیە.

٥-وشەی (ءَاۡعۡجَمِيٌّ) لە سورەتی (فصلت) ئایەتی (٤٤) هەمزەی دووەمی

(سهێل) دەکەی وەکو نێوانی هەمزە و ئەلیف دەخوێنیەوە.

٦-لە سورەتی (حجرات) ئایەتی (١١) ﴿بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ﴾ لە کاتی گەیاندنی هەردوو هەمزەی (وصل)ی (الاسم) ناخوێندرێتەوە و لامەکەشی ژێردار دەکرێ بەم جۆرە (بئس لِسْمُ الفسوق) وە ئەگەر (الاسم) لە سەرەتادا بیخوێنی دەتوانی هەمزەی (ال)ی تەعریفەکەی بخوێنیەوە یا نەیخوێنیەوە بەم شێوە (اَلِسْمُ الفُسوقُ) (لِسْمُ الفُسوق).

٧-هەندێ وشە هەن لە قورئاندا لە ئەسڵدا دوو وشەن بەڵام بە شێوەی یەك وشە نووسراوە، جا ئەگەر لەسەری وەستای لەبەر هەر هۆیەك نابێ لێکییان جیا بکەیەوە و لەسەر وشەی یەکەم بوەستی بەڵکو دەبێ لەسەر وشەی دووەم بوەستی وە هەمان وشەش ئەگەر بە شێوەی دوو وشە نوسرا بوو ئەوە لەکاتی وەستانی ناچاری (إضطراري) یا (إختیاری) دەتوانی لەسەر وشەی یەکەم یا دووەم بوەستی.

بۆ نموونە (این ما) دەتوانی لە کاتی وەستانی ناچاری یا (إختباری) لەسەر (این) یا لەسەر (ما) بوەستی چونکە بە جیا و پچڕاوی نووسراوە، بەڵام (اینما) کە بە شێوەی یەك وشە نووسراوە، ئەوە پێویستە لە کاتی وەستان لەسەر وشەی دووەمی بوەستی نابێ لێکییان جیا بکەیەوە.

٨-لە (یاأیُّها) دروست نییە لەسەر (یا) بوەستی جیای بکەیتەوە لە (أیّها)، وە هەروەها ئەم سێ وشەیەش (یا بنی ءادم) نابێت لێکییان جیا بکەیتەوە، بەڵکو ئەگەر وەستای لەسەر (ءادم) دەوەستی.

٩-(ها)ی ئاگادار کردنەوە (تنبیە) لە هەموو قورئاندا گەیاندراوە بەوەی دوای خۆی (موصولة بما بعدها) وەك (هذا) (هؤلاء) جا کە وەستای لەسەر (ها) ناوەستی بەڵکو لەسەر وشەکەی دوای ئەو دەوەستی.

١٠-لە سێ شوێن لە قورئان (أیّە) ئەلیفی لێ لابراوە (حُذِفَتْ منه الالف) لە

سورەتی نور ئایەتی (٣١) (أَيُّـهَ الْمُؤْمِنُـونَ) لـە سورەتی (زخرف) ئایەتی (٤٩) (يَاأَيُّهَ السَّاحِرُ) وە لەسورەتی (الرحمن) ئایەتی (٣١) ﴿أَيُّهَ الثَّقَلَانِ﴾ جا لەم سێ شوێنە ئەگەر وەستای لەبەر ناچاری یا (إختباری) لەسەر وشەی (أَيُّهَ) بە (هاء) دەوەستێ بە بێ ئەلیف، وە هایەکەش دەکەی بە سکوندار بەم شێوەیە (أَيُّهْ)

١١-(فَمَالِ هَؤُلَاءِ) لە سورەتی النساء(الآية ٧٨)

(﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ سورة المعارج الآية ٣٦

﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ﴾ سورة الفرقان الآية ٧

﴿مَالِ هَذَا الْكِتَابِ﴾

نموونە بۆ سێیەکەی تریش (فمال هؤلاء) وەردەگرین دروستە (جائز)ە لەسەر (فما) بوەستێ وە هەروەها دروستە لەسەر (فمال) بوەستێ، وە دروستە بەبێ وەستان بیانگەیەنی بڵێی (فمال هؤلاء) کەواتە ئەمە سێ باری هەبوو، وە کە لەسەر (فمال) وەستای لامەکەی بە سکونداری دەخوێنیەوە بەم شێوە (فمالْ)

١٢-(إلْ ياسين) سورەتی (صافات) ئایەتی (١٣٠) ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك لەسەری وەستای لەسەر (إلْ) ناوەستێ بەڵکو لەسەر بەشی دووەمی دەوەستێ و کۆتاییەکەی بە سکونداریش دەخوێنیەوە بەم شێوە (إلْ ياسينْ)

١٣-وشەی (لنسفعاً) لە سورەتی (علق) ئایەتی (١٥) هەرچەندە ئەسڵەکەی بەم شێوەیە (لَنَسْفَعَنْ) بە نونی توکیدی خەفیف بەڵام لە کاتی وەستان پێویستە بە ئەلیف لەسەر کۆتاییەکەی بوەستی بەم شێوە (لنسفعا)، وە وێنەی ئەم وشەیەش وشەی (وليكوناً) لە سورەتی (یوسف) ئایەتی (٣٢) بە ئەلیف لەسەری دەوەستین بەم شێوەیە (وليكونا)

١٤-ئەم پیتانەی لەم وشانەدا کە ئەم نیشانەیان (ْ) لەسەرە دەنوسرێن

بەلام ناخوێنرێنەوە:

( (قالوا) (أوْ لأاذْبَحَنَّهُ) لِشَايْءٍ ) (مائة) ( أولئك) ( أولوا) (سأوريكم) ( بأييد) (وملايه) (نبإي المرسلين) (أولات) (أولئكم) (هم أولاء ).

١٥-لە نۆ شوێن (یاء) دەنوسرێ بەلام ناخوێنرێنەوە کە ئەمانەن:

١-﴿أفإين مات﴾سورەتی (آل عمران ) ئایەتی (١٤٤).

٢-﴿أفإين مت﴾ سورەتی (انبیاء) ئایەتی (٣٤).

٣-﴿من نبإي المرسلين﴾ سورەتی (انعام) ئایەتی (٣٤).

٤-﴿من تلقاءي﴾ سورەتی (یونس) ئایەتی (١٥).

٥-﴿وإيتاءي ذي القربى﴾ سورەتی ( نحل) ئایەتی (٩٠).

٦-﴿ومن ءاناءي الليل﴾ سورەتی (طه) ئایەتی (١٣٠).

٧-﴿أو من وراءي حجاب﴾ سورەتی (شوری) ئایەتی (٥١).

٨-﴿والسماء بنيناها بأييد وإنا لموسعون﴾ سورەتی (ذاریات) ئایەتی (٤٧).

٩-﴿بأييكم المفتون﴾ سورەتی (قلم) ئایەتی (٦).

١٦- ئەم وشانەی کە لەم بەشە ئایەتانە دەرمان هێناون لەکاتی وەستان لەسەریان بەم شێوەی کە نووسراون بەم شێوە لەسەریان دەوەستێ.

(١- ﴿مِن وَرَآيِ حِجَابٍ﴾ ( الشورى: ٥١) ← وراءْ.

٢-﴿مِن تِلْقَآيِ نَفْسِيٓ﴾ (یونس: ١٥ ← تلقاءْ.

٣-﴿وَإِيتَآيِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ (النحل: ٩٠← وإيتاءْ.

٤-﴿جزاؤا الظالمين﴾ (الحشر: ١٧) ←جزاءْ.

٥-﴿ تفتؤا تذكر﴾ (یوسف:٨٥) ← تفتأْ.

٦-﴿شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ﴾ (الشورى: ٢١) ← شركاء.

١٧-ئەم وشانەی کە دەرمان هێناون و بە جیا نووسراوە لەم بەشە ئایەتانە، کە لە ئەمانەوە دەستت کرد بە خوێندنەوە بەو شێوەی کە نوسراون دەخوێنرێنەوە:

(١-﴿ثُمَّ لْيَقْطَعْ﴾ (الحج:١٥) ← لیقطعْ

٢-﴿وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ﴾ (ص:١٣) ← الـْأَيْكَةِ

٣-﴿قُلِ اللَّهُمَّ﴾ (آل عمران :٢٦) ← اللهمَّ

٤-﴿إِنِ امْرُؤٌا﴾ (النساء:١٧٦) ← إمْرُؤٌا

٥-﴿فَقَالُوا ابْنُوا﴾ (الكهف:٢١) ← إبْنُواْ

٦-﴿آمَنُوا اتَّقُوا﴾ (مجادلة) ← إتَّقُوا.

١٨-لە قورئاندا زۆر ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ جار وایە هەمزەیەکی فەتحەدار لەسەر ئەلیف کراوە واش هەیە هەمزە فەتحەدارەکە لە پێش ئەلیف کراوە، جا ئەگەر هەمزە فەتحەدارەکە لەپێش ئەلیف کراوە ئەوە چۆن لەکوردی دەخوێنیەوە (ئا) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە وەك : (ءامنوا-سَآوىٰ-ءَايَتٌ)

بەلام ئەگەر هەمزە فەتحەدارەکە لەسەر ئەلیف بوو ئەوە چۆن لە زمانی کوردی دەڵێی (ئە) بەم شێوە دەخوێنرێتەوە وەك:
(أنَّ-أرسلْنا-الأمْرُ-أتى)

١٩-وشەی (تَأْمَنَّا) لە سورەتی یوسف ئایەتی (١١).
أ-ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بەم شێوەیە (تَأْمَنُنَا) پێکهاتووە لە (فعل مضارع) و فاعلێکی شاراوە (مستتر) کە بۆ باوکی یوسف دەگەڕێتەوە وە بە (مفعول به) کە راناو (ضمیر)ی (نا)یە کە دەکا براکانی یوسف.

ب-عەرەب بۆیە ئەم وشەیە بەم شێوەی کە لە قورئاندا نووسراوە دەخوێننەوە لە بەر قورسی، چونکە سێ پیتی مینگەداری حەرەکەدار لە دوای یەکتر هاتوون کە دەکا میم و دوو نوونەکە، جا نونی یەکەم کراوە بە سکوندار و دەغم کراوە لەگەڵ نونی دووەم بەم شێوەی لێ هاتووە کە لە قورئاندان نووسراوە.

ج-ئەم وشەیە لەسەر دەمی پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوەی کە ئێستا هەیە بەم شێوە نووسراوە.

د-قورئانخوێن بۆی هەیە وشەی (تأمنّا) بە دوو شێوە بخوێنێتەوە.

یەکەم: (الإشمام) ئەوەی ئاشکرایە وشەی (تأمنّا) نونێکی شەددەداری تیایە نونە شەددەدارەکە پێکهاتووە لە دوو نون، نونێکییان سکوندارە نونێکییان فەتحەدارە هەروەکو دیارە جا لەکاتی خوێندنەوەی کە دەگەیە سەر نونە سکوندارەکە دەمت وەکو ئەوە لێ دەکەی وەکو چۆن بۆر (ضمة) دەریکەی، بەڵام بەبێ دەنگ، ئەم دەم بەم شێوە لێ کردنە لەگەڵ ئەم مینگە درێژەدا دەبێ لەگەڵ نونە سکوندارەکە دەکرێ ئەمەش بۆیە وا دەکەی بۆ ئەوەی نیشانی بدەی کە ئەم نونەی ئێستا سکوندارە لە بنەڕەتدا بۆردارە.

دووەم: (رَوم) ئەم بارەی دووەمە بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە (تأمَنُنا) بەڵام نونی یەکەم کە نونە بۆردارەکەیە کەمەك بە پەلە و کەمەك بە دەنگێکی نزم تر دەخوێنرێتەوە لە پیتەکانی دراوسێی.

٢٠-﴿نُجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾ (سورة الأنبياء:٨٨) وشەی (نجی) لێرەدا بە یەك نون نوسراوە، بەڵام بەم شێوە (نُنْجِي) دەخوێنرێتەوە.

٢١-ئەلیفی (ثَمُودا) لە سورەتی (هود:٦٨)، (فرقان:٣٨)، (عنكبوت:٣٨)، (نجم:٥١) بە نووسین دەنوسرێ، بەڵام نە لەکاتی وەستان لەسەری وە نە لە کاتی ڕۆیشتن لەسەری ناخوێنرێتەوە.

# کۆمەڵێ زانیاری دەربارەی قورئان

# گەورەیی خوێندن و فێربوونی قورئان

خوا دەفەرمووێ:﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾﴾

(الفاطر:٢٩–٣٠)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە کتێبی خوا دەخوێننەوە بە چاکی نوێژیان بە جێ هێناوە وە لە وەی کە پێمان داون بە نهێنی و ئاشکرا دەبەخشن چاوەڕوانی بازرگانییەکن هەرگیز زەرەر ناکات (٢٩) بۆ ئەوەی (خوا) بە تێرو تەواوی پاداشتییان بداتەوە و لە بەهرەی خۆی زیاتریشییان پێ بدات بەڕاستی خوا لێبوردەی سوپاس وەرگرە(٣٠).

١–(عن عبدالله بن عَمْرو بن العاص–رضي الله عنه– عن النبي (ﷺ) قال: (يُقالُ لِصاحِبِ القرآنِ إقرا وارتقِ ورتل كما كنتَ تُرتل في الدُنيا، فإنَّ منزلتك عند آخر آيةٍ تقْرَؤُها).

رواه ابو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح

يُقالُ: دەگوترێ، قيل: گوترا.

(لصاحبِ القرآن: المراد بصاحب القرآن في الحديث من يلازمُهُ بتلاوتِه والعمل بما فيه): یانی لەم فەرموودەیە مەبەست بە (صاحبِ القرآن) ئەوانەن کە دەیخوێننەوە و کاری پێ دەکەن.

(وارتق): بەرزبەوە (إرتقاء) سەرکەوتن، بڵند بوون، وە سەرکەوتن.

(ورتل): (ترتيل القراءة: التأني فيها وتبيين حروفها وحركاتها)

واتە: قورئان خوێندن بە (ترتيل) بریتییە لە لەسەرخۆ خوێندن و ئاشکرا کردن و دەرخستنی پیت و حەرەکاتەکان.

ماناى فەرموودەكە: (لە قیامەت) دەگوترێتە هاوەڵى قورئان بخوێنە و بەرز بەوە (لە بەهەشت) وە قورئان بە (ترتیل) بخوێنە هەروەكو لە دونیادا بە (ترتیل)ت خوێندووە، بێگومان شوێنى تۆ (لە بەهەشت) لاى كۆتا ئایەت دایە كە دەیخوێنى.

(مُنذري) لە (الترغيب والترهيب) لە دواى ئەم فەرزەدا دەڵێ:

(قال الخطابي: جاء في الأثر ان عدد آي القرآن على قَدْر دَرَج الجنة، فيقال للقارئ ارقَ في الأدراج على قَدْرِ ما كنت تقرأ من آي القرآن فمن استوفى قراءة جميع القرآن استولى على أقصى دَرَج الجنة في الآخرة، ومَن قرأ جُزءاً منه كان رقيُّهُ في الدرَج على قَدْر ذلك فيكون منتهى الثواب عند منتهى القراءة)

واتە: خەتابى دەڵێ: لە (أثر)ێكدا هاتووە كە ژمارەی ئایەتەكانی قورئان ئەوەندەی پلەكانی بەهەشتن، جا دەگوترێتە قورئان خوێن بەرزبەوە لەو پلانەدا بەقەد ئەوەندەی كە خوێندووتە لە ئایەتەكانی قورئان، هەر یەكێك هەموو قورئانی خوێندبێ دەگاتە ئەوپەڕی و بەرزترین پلەكانی بەهەشت لە دوا رۆژدا، وە هەر یەكێك جوزئێكی خوێندبێ بەرزبوونەوەی لە پلەكان بە قەد ئەو جوزئە دەبێت، كۆتایی پاداشت لەگەڵ كۆتایی خوێندنەوەكەیە.

٢-(عن النَّواس بن سمعان-رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول:

(يُؤتى يومَ القيامة بالقرآن وأهلِه الذين كانوا يعملون به في الدنيا تقدُمُهُ سورة البقرة وآل عمران تُحاجّان عن صاحبهما) رواه مسلم

(يؤتى): دەهێنرێ.

(تقدُمُهُ): واتە (تتقدَّمُهُ) یانی پێشی دەكەوێ.

تحاجان: تجادلان، بەرگری دەکەن.
صاحبهما: (وهو التالي لهما العامل بهما)واتە ئەوەی کە (بقرة و آل عمران)ی خوێندوە و کاری پێیان کردووە.
مانای فەرموودەکە:
لە ڕۆژی دواییدا قورئان و ئەهلەکەی دەهێنن، ئەوانەی کە رەفتارییان پێ کردووە لە دونیادا، سورەتی (البقرة) و (آل عمران) پێش قورئانەکە دەکەون بەرگری لە هاورێکەیان دەکەن.

٣-(عن ابي امامة الباهليّ-رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إقرءوا القرآن فإنّهُ ياتي يومَ القيامة شفيعاً لأصحابه، إقرءوا الزّهراوين البقرة وسورة آل عمران، فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان، او كأنهما غيايتان، او كأنهما فرقان من طير صوافٌ، تحاجان عن اصحابهما.
إقرءوا سورة البقرة، فإن اخذها بركة وتركها حسرةٌ، ولا تستطيعها البطلة)
قال معاوية بلغني أن البطلة : السحرة. رواه مسلم.
واتە: قورئان بخوێنن، چونکە ڕۆژی قیامەتێ دێت تکا بۆ هاوەڵانی دەکات، هەردوو شەوقدارەکە بخوێنن (بقرة وآل عمران) چونکە ئەم دوو سورەتە لە ڕۆژی قیامەت دێن وەك دوو پەڵە هەور یا وەك دوو سێبەر یا وەك دوو پۆل لە باڵندە کە باڵیان کردبێتە وە بەرگری لە خاوەنەکانیان دەکەن، سورەتی (بقرة) بخوێنن چونکە خوێندنی پیت و بەرەکەتە و وازلێهێنانی مایەی داخە، وە کەسانی جادوگەر پێی ناوێرن.

٤-(عن إبن مسعود-رضي الله عنه- قال: قال رسول الله (ﷺ): ( مَن قرا حَرْفاً من كتاب الله فلَهُ به حسنة، والحسنة بعشر امثالها، لا اقول (الم) حرف ولكنَ الفٌ حرفٌ ولامٌ حرف وميم حرفٌ) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

واته: هەر یەکێك یەك پیت لە قورئان بخوێنێ، بەهۆی خوێندنی ئەم پیتە چاکەیەکی بۆ هەیە، وە هەر چاکەیەکیش بە دە چاکەیە، من نالێم (الم) یەك پیتە، بەڵکو (الف) یەك پیتە وە (لام) یەك پیتە، وە (میم) یەك پیتە.

٥-(عن عائشة-رضي الله عنه- قالت: قال رسول الله (ﷺ):(الذي يقرا القرآن وهو ماهرٌ به مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرا القرآن ويتتعتعُ فيه وهو عليه شاق له اجران) رواه البخاري ومسلم(٧٩٨).

(ماهر): کارامە، شارەزا، لێزان.

(السفرة): ئەو فریشتانەن کە دەنێررێن بۆ لای پێغەمبەران.

(الکرام): بەڕێز.

(البررة): (المطیعین) چاکەکاران.

(یتتعتع فیه): (یتردد في قراءته)

مانای فەرموودەکە: ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ تێیدا شارەزایە (بە ئاسانی دەیخوێنێ بەبێ وەستان و لێ تێك چوون) لەگەڵ ئەو فریشتە بەڕێز و چاکە کارانەدان کە دەنێردرێن بۆ لای پێغەمبەران.

وە ئەو کەسەش کە قورئان دەخوێنێ و زمانی تەتەڵە دەکات تیایدا لەسەری زەحمەتە دوو پاداشتی بۆ هەیە.

سوود:

زانایان دەڵێن: ئەوانەی یەکەم کە شارەزان لەخوێندنی قورئاندا باشترو پادداشتییان زیاترە لە ئی دووەم.

٦- عن ابن عمر (رضي الله عنهما) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: لاحسد إلا في اثنتين: رجلٌ آتاه الله القرآن، فهو يقومُ به آناء الليل و آناء النهار، ورجلٌ آتاه الله مالاً فهو ينفقه آناء الليل وآناء النهار، متفق عليه.

الحسد: خۆزگە خواستنە بەنەمانی نیعمەتێك كەبەیەكێك دراوە جا ئ دینی بێت یا دونیایی، بەلأم (غبطة) حەز دەكەی ئەو نیعمەتەی كە بەبەرامبەرەكەت دراوە بەتۆش بدرێ بێ ئەوەی لە ئەو بسەندرێتەوە، جا لێرەدا (لاحسد) واتە (لاغبطة).

والآناء: الساعات: كاتەكان

مانای فەرموودەكە: ئیرەیی بردن دروست نییە، تەنها لەدوو شت نەبێت: پیاوێك خودا قورئانی پێ داوە، ئەویش بەشەو و بەرۆژ دەیخوێنێتەوە، وە پیاوێكیش خودا مالّ و سامانی پێ داوە، ئەویش بەشەو و بەرۆژ دەیبەخشێتەوە.

ئەم فەرموودەیە هاندانە بۆ موسلّمانان كە هەولّ بدەن ئەم دوو نیعمەتە گەورەیە بەدەست بێنن.

٧- عن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرآنَ وَعَلَّمَهُ) رواه البخاري.

واتە: باشترینتان ئەوكەسەیە كە فێری قورئان دەبێت و خەلّكیش فێردەكات.

لە ریوایەتێكی (بخاری) ئەم فەرموودە بەم شێوەش هاتووە (إنَّ افضلكم من تعلم القرآن وعلّمهُ) جائەوانەی كە خەلّكان فێری قورئان دەكەن ئەوە بۆیان دەبێت بە (صدقة جاریة) لەدوای مردنیشیان سوودی لێ وەردەگرن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: (إذا ماتَ إبْنُ

ادم انقطع عمله إلا من ثلاث: صدقةٍ جارية، او علم ينتفع به، او ولدٍ صالح يدعو لهُ) رواه مسلم.

٨- عن عقبة بن عامر قال: إنّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: (لوْ جُعل القرآن في إهابٍ ثُمّ القيَ في النار ما احترق)[1]

واته: ئەگەر قورئان بخرێتە ناو پێستێك و فڕێبدرێتە ناو ئاگری (دۆزەخ)ەوە ناسوتێت (هەر ئیماندارێك قورئانی لەبەر بێت ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ).

٩- عن انس بن مالك (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (إنّ لله اهلينَ من الناس، قالوا يارسول الله مَن هُمْ؟ قال: هم اهل القرآن اهل الله وخاصته)[2].

واته: بەڕاستی خوا لەناو خەڵكیدا دۆستی هەیە، وتیان: ئەمانە كێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوانە قورئان خوێنەكانن، دۆست و هەڵبژێردراوی خودان.

(١) رواه احمد في المسند ٤/١٥١ او الدّارمي في السنن: ٢/٤٣٠ و ابو يعلى في المسند ٣٠٧/٢ (١٧٣٩) وحسنه الألباني وضعفه شعيب الأنؤوط لسوء حفظ ابن لهيعة.

(٢) رواه احمد وابن ماجة وصححه الالباني.

# گەورەترین سوورەت و ماناکەی

عن رافع بن المعلّى (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) الا أُعلّمكَ أعظمَ سورةٍ في القرآن قبل أن تخرج من المسجد؟ فأخذ بيدي، فلمّا أردنا أن نخرج قلت يا رسول الله إنك قلت: لأُعلّمنك أعظم سورةٍ في القرآن؟ قال: الحمد لله رب العالمين، هي السبعُ المثاني والقرآن العظيمُ الذي أُتيتُهُ. رواه البخاري وابو داود والنسائي.

السّبعُ المثاني: زانایان چەند مانایەکیان بۆ لێك داوەتەوە لەمانە:

١- چونکە لەم سوورەتەدا ئینسان سوپاس و ستایشی خوا دەکات.

٢- چونکە ئەم سوورەتە لەهەموو رکاتێکدا دووبارە دەکرێتەوە.

### ماناى فەرموودەكە:

رافیعی كوڕی موعەللا (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی پێم: ئایا گەورەترین سورەتی قورئانت فێر بكەم پێش ئەوەی لەمزگەوت بچیتە دەرەوە؟ دەستی گرتم، جا كاتێ كە ویستمان بچینە دەرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت گەورەترین سورەتی قورئانت فێردەكەم، فەرمووی: الحمد لله رب العالمين كە ئەویش حەوت ئایەتی دووبارە بووەو قورئانی گەورەیە، كە بەمن دراوە.

## ماناى سورەتى ( فاتحة ) بەكورتى:

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

خۆم دەپارێزم بەخوا لە شەیتانی دەركراو و دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا.

أعوذ: خۆم دەپارێزم.

الرجيم: (المطرود من رحمة الله) دەركاو لەڕەحمەتی خوا

ئەوەی زانراویشە (استعاذة) ئائیەتێك نییە لەسوورەتی (فاتحة).

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای (الرحمن الرحيم)

(الرحمن الرحيم) دوو ناو و دوو سیفەتی خوان لەچاوگی (الرحمە) وەرگیراون وە هەردووكیان سیفەی موبالەغەن، بەلام (الرحمن) مانای موبالەغەی زیاتری تێدایە لە (الرحيم).

(الرحمن) وا دەگەیەنێ كە خودا خاوەنی ڕەحمەتی زۆرە وە (الرحيم) مانای وایە خودا خاوەنی ڕەحمە بەرامبەر بەندەكانی بەسەریاندا دەڕێژێنێ لەدونیاو لەقیامەت وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ (رحمان الدنيا والآخرة ورحيمهُما).

(الحمد لله ربّ العالمين) هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

الحمد: ئەلیف و لامی سەر وشەی (حمد) بۆ جینسە، واتە هەموو تاكێك

لەتاکەکانی (حمد) بۆخودا.
ربّ: لێرەدا بەمانای دروستکەر و بەخێوکەرو بەڕێوەبەری کاروبار هاتووە.
العالمین: کۆیە تاکەکەی (العالم)ە (عالم)یش کۆمەڵە شتێکە کە لەیەك بچن وەك عالەمی ئینسان، عالەمی (جن) عالەمی فریشتە، عالەمی ئاژەڵ، عالەمی رووەك، هتد.. کەواتە: وشەی (العالمین) لێرەدا هەموو بوونەوەر دەگرێتەوە.
(الرحمن الرحیم) ئەوەمان لەمانای (بسملة) باس کرد.
(مالك یوم الدین) خاوەنی رۆژی پاداشت و سزا.
مالك: خاوەن.
یوم الدین: رۆژی پاداشت و سزا (یوم الجزاء).
(ایاك نَعبُدُ وإیّاك نستعین)
(خودایە) تەنها تۆ دەپەرستین وەتەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین.
إیاك: بەس تۆ، تەنها تۆ.
نَعبُدُ: دەپەرستین.
نستعین: داوای یارمەتی دەکەین.
(اهدنا الصراط المستقیم) رێنموونیمان بکە بۆ رێگای راست، واتە: ئاشنامان بکە پێی. دامەزراومان بکە لەسەری.
یا بڵێین (خوایە رێنماییمان بکە بۆ ئیسلام و یارمەتیمان بدە کە لەسەری بەردەوام بین).
(صراط الذین انعمت علیهم): رێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون.
(غیر المغضوب علیهم) نەك (رێی) ئەوانەی کە خەشم و غەزەبی (تۆیان) لێ گیراوە، (وەك جوولەکە).
(ولاالضالین) وە نەك (رێی) گومڕایان. (وەك دیانەکان).
(آمین) ئەم وشەیە بەشێك نییە لەسوورەتی (فاتحة) واتە: (اللهم استجب دعاءنا) خوایە پاڕانەوەکەمان گیرا بکە.

## گەورەترین ئایەت و ماناکەی

عَن أبَيِّ بن كعبٍ (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): يا أبا المنذر أتدري أيُّ آيَةٍ من كتاب الله معك أعظم، قال، قالت: الله ورسولهُ أعلمُ، قال: يا أبا المنذر أتدري أيُّ آيةٍ من كتاب الله معك أعظم، قال، قلت: (الله لا اله الله الا هُوَ الحي القيوم) قال: فضرب في صدري وقال: والله ليهنك العلم أبا المنذر، رواه مسلم (٨١٠) وابو داود (١٤٦٠).

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ( ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەی (ابو المنذر) ئایا دەزانی چ ئایەتێك لەکتێبی خوا لای تۆ لەهەموویان گەورەترە؟ ئوبەی دەڵێ، گوتم: خوا و پێغەمبەری خوا زاناترە، فەرمووی ئەی (ابو المنذر) ئایا دەزانی چ ئایەتێك لەکتێبی خوا لای تۆ گەورەترە؟ ئوبەی دەڵێ، گوتم: (الله لا اله الا هو الحيُّ القيوم) ئوبەی دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستی لەسینگم دا فەرمووی: بەخوا (پێکاوتە) زانست و زانیاریت لێ پیرۆزبێت ئەی (ابو المنذر).

**ماناى ( آية الكرسي ) ئایەتی ( ٢٥٥ ) لەسوورەتی ( البقرة ).**

(الله لا اله إلا هو) خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی (ڕاست) نییە بێجگە لەو

یا بەشێوەیەکی تر بڵێین: خوایە کە ناوی (الله)یە هیچ پەرستراوێکی تر نییە بەڕاستی و هیچ شتێك شیاو و شایانی پەرستن نییە بێجگە لەو.

(الحيُّ القَيّوم) زیندووەو سەرپەرشتیکەرە.

(الحيّ) زیندووە بەبێ سەرەتاو دوایی هاتن واتە نەبوونی نەبووە و

ئەمانیشی بۆنییە، کەواتە زیندوویەکەی لەخۆیەتی لەغەیری خۆی دەست کەوتی نەبووە.
(القیوم) تەدبیرکەرو راگری بوونەوەرە بەگیاندارو بێ گیانییەوە.
(لا تأخذهُ سنة ولا نوم) نە بۆرژان دەیگرێ و نەخەو. یا بڵێین: نەوەنەوز نەیگرێ و نەخەو.
چونکە ئەگەر یەکێك لەم دووانە بەسەر خودادا بێت بوونەوەرتێك دەچێت.
(لهُ مافي السماوات وما في الأرض) هەرهی ئەوە هەرچی لەئاسمانەکان و هەرچی لەزەوی دایە.
(من ذا الذي یشفعُ عندهُ إلاّ بإذنه) کێیە ئەوکەسەی لەو رۆژەدا بتوانێ تکای لەلا بکات مەگەر بە رێپێدانی خۆی.
(یعلم مابین ایدیهم وما خلفهم) ئاگادارە بەئەوەی بەبەردەمی (ئادەمی)یەوەیە (لە دونیا لەبەردەستیاندایە) وە ئەوەی لەدواوەیەتی (لەرۆژی دواییدا بۆیان ئامادەکراوە).
عن السدی (یعلم مابین ایدیهم) قال: مابین ایدیهم فالدنیا (وما خلفهم) فالآخرة.
واتە: (سدی) دەڵێ: (مابین ایدیهم) ئەمە مەبەست پێی دونیایە (وما خلفهم) ئەمە مەبەست پێی دوا رۆژە.
واتە: خوا دەزانێ و ئاگایە بەهەموو کاروباری جیهانی، هەرچی وا لەئاسمانەکان و زەویدا، وە بەهەموو کاروباری رۆژی دواییان.
(ولا یحیطون بشيء من علمه إلا بما شاء) وە کەس ئاگای لەهیچ زانینێکی ئەو نییە مەگەر بەوەی کەخۆی بیەوێ.
(وسع کرسیهُ السماوات والأرض) کورسی خوا هەموو ئاسمانەکان و زەویی گرتۆتەوە.
یا بڵێین: کورسی خوا فراوانی هەیە بۆ ئاسمانەکان و زەوی و هەمووی ئەگرێتەوە و دەوری داوان.
قال السدي: (السموات والأرض في جوف الکرسي والکرسي بین یدي

العرش) واتە: ئاسمانەکان و زەوی لەناو کورسی دان، کورسیش لەژێر عەرش دایە.
(وَلَا يَئُودُهُۥ حِفْظُهُمَا) وە پارێزگاری کردنی ئاسمانەکان و زەوی قورس و گران نییە لەسەری.
یا بەم شێوە: وە ئاگاداری کردن و پارێزگاری ئاسمانەکان و زەوی خوا ماندوو ناکات و ئەرك و زەحمەتی نییە بۆی.
عن ابن عباس (رضي الله عنه): في قولهِ تعالى ﴿ وَلَا يَئُودُهُۥ حِفْظُهُمَا ﴾ قال لا يثقل عليه حفظهما، واتە: وە گران نییە لەسەری پارێزگاری کردنیان.
(وهو العليُّ العظيم) وە ئەوە، بڵند و گەورەیە.
یا بڵێین: وە ئەوە، بڵند پلەی پایە گەورە.

## گەورەیی گوێگرتن بۆ قورئان

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا لَهُۥ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعرف: ٢٠٤).
واتە: وەکاتێك کە قورئان خوێندرا گوێ بگرن بۆی وە بێ دەنگیش بن بەڵکو میهرەبانیتان پێ بکرێ.
زانایان زۆر تەفسیریان بۆ ئەم ئایەتە کردووە، بەلام رووکەش و رواڵەتی ئەم ئایەتە ئەوەیە: وەك زانایانی زاهیری ئەفەرموون: کەلەهەر شوێنێ و لەهەر کاتێ و لەبەر هەر هۆیە قورئان خوێنرا، پێویست و فەرزە گوێگرتن بۆی و بێ دەنگ بوون.
عن مجاهد يقول في هذه الآية: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا لَهُۥ وَأَنصِتُوا﴾ (الاعراف:٢٠٤) قال : في الصلاة والخطبة يوم الجمعة.

واتە: مجاهد دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرمووێ: ئەمە بۆکاتی نوێژ و خوتبەی ڕۆژی هەینییە.

وە (طبري)یش ئەم تەفسیرەی پێ لەهەموویان بەهێزترە.

(ابن کثیر) لە تفسیرەکەیدا دەڵێ: عن مجاهد قال: لا بأس اذا قرأ الرجلُ في غير الصلاة ان يتكلم، وكذا قال سعيد بن جبير والضحاك وابراهيم النخعي وقتادة والشعبي والسدى وعبدالرحمن بن زيد بن اسلم: ان المراد بذلك في الصلاة.

واتە: موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: موسڵمان گوناهبار نابێت ئەگەر لەدەرەوەی نوێژ قورئان خوێنراو ئەو قسە بکات وە بەم شێوەش سەعیدی کوڕی جوبەیر و (ضحاك) و ابراهیمی نەخەعی و قەتادە و شەعبی و سدی و عبدالرحمن کوڕی زەیدی کوڕی (اسلم) فەرموویانە: مەبەست پێی لەوە لەناو نوێژە.

بەڵام موسڵمان با هەوڵ بدات وەکو ئەوە بکات کە زانایانی زاهیری فەرموویانە.

وە خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ۝﴾ (الانفال:٢-٤).

واتە: بێ گومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك کەباسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت، کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن(٢) ئەوانەن کەبەڕاستی

نوێـژەکانیان بـەجێ دەهێـنن وە لـەو رسـق و رۆژیـەی پێمـان داون دەیبەخشن(٣) هەر ئەوانە بڕواداراتی راستەقینە پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان، وە لێ خۆشبوون و رۆزی پەسەند و چاك (یان بۆ هەیە)(٤).

عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال لي النبيّ (صلى الله عليه وسلم): اقرأ عليّ القرآنَ، فقلتُ: يارسولَ الله اقرأ عليك وعليك أنزل؟! قال: إني أحبُّ أن أسمَعَهُ من غيري، فقرأتُ عليه سورة (النساء) حتى جئتُ إلى هذه الآية ﴿فكيف إذا جئنا من كل أمةٍ بشهيدٍ وجئنا بك على هؤلاء شهيدا﴾ قال: حَسْبُك الآن فالتفتُّ إليه فإذا عيناه تذرفان. رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: قورئانم بۆ بخوێنە، دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئان بۆتۆ بخوێنم کە بۆتۆ دابەزیوە؟ فەرمووی: من حەزدەکەم لەغەیری خۆمەوە گوێم لێ بێت، منیش سورەتی (النساء)م بۆ خوێندەوە تا گەیشتمە ئەو ئایەتە ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾ (النساء:٤١)

فـەرمووی: ئێستا ئەوەنـدە بەسـە، تەماشـام کـرد بینـیم چـاوەکانی فرمێسکیان لێ دەهاتە خوارەوە.

عن انس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لأبي بن كعب: (ان الله أمرني أن أقرأ عليك (لم يكن الذين كفروا) قال: وسماني لك؟ قال: نعم فبكى، رواه البخاري ومسلم.

واتە: ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بە ئوبەی کوڕی کەعب، خودا فەرمانی پێ داوم کە سوورەتی (لم يكن الذي كفروا) بخوێنم بۆت، ئوبەی وتی: ناویشی هێنام لات! فەرمووی: بەڵێ، ئوبەی لەخۆشیاندا دەستی کرد بەگریان.

جا هەروەکو چۆن ئەوکەسەی کە قورئان دەخوێنێ چ پاداشتێکی بۆ هەیە

هەمان پاداشتیش هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە گوێی بۆ دەگرن.

جا سوپاس بۆ خوا هەریەکێك بیەوێ لەڕێگای بیستنی قورئاندا پاداشت کۆ بکاتەوە کارەکە زۆر ئاسان بووە لەماڵ بێت یا لەسەیارە یا لەدوکان یا لەهەر شوێنێکی تر لەڕێگای رادیۆ یا تەلەفزیۆن یا تەسجیل یا قەناتە فەزاییەکان یا شتی تر دەتوانی گوێ بیستی چەندین دەنگی خۆش و خوێندنەوەی قورئانی ڕێك و پێك بێت لەم ڕێگایەوە پاداشتی گەلێك زۆر بۆخۆی کۆبکاتەوە.

# خوێندنی چەند ئایەت و سوورەتێك لەكاتی تایبەت

١- عن أبي مسعود البدريّ (رضي الله عنه) عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال:

( مَنْ قرأ بالآيتيْن من آخرِ سُورةِ البقرة في ليلةٍ كفتاهُ) متفق عليه.

واتە: هەركەسێك دوو ئایەتی كۆتایی سورەتی (البقرة) بخوێنێ لەشەوێكدا بەسیەتی (لە قیام اللیل).

شەو كاتەكەی دەست پێ دەكات، لە رۆژئاوا بوونەوە تا بانگی بەیانی یا تا (طلوع الفجر).

جا هەر موسڵمانێك لەشەوێكدا ئەم دوو ئایەتە بخوێنێ كەلە (ءامن الرّسول) دەست پێ دەكات تا كۆتایی (بقرە) ئەوە بەسیەتی، (قیل: كفتاه المكروه تلك الليلة) واتە: گوتراوە: بەسیەتی بۆ پارێزران لەشەڕ و زیانی ئەم شەوە.

٢- (عن أبي أمامة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) (مَن قرأ آية الكرسيّ دُبُر كُلّ صلاةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ من دخول الجنة الاّ أنْ يموت) (رواه النسائي والطبراني وصححه الشيخ الالباني.

واتە: هەریەكێك (آية الكرسي) بخوێنێ لەدوای هەموو نوێژێكی(فەرز) هیچ شتێك قەدەغە (منع)ی ناكات لە چوونە بەهەشت تەنها مردن نەبێت.

٣- عن أبي سعيد الخدريّ (رضي الله عنه) أن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال: من قرأ سورة الكهف في يوم الجمعةِ أضاء لَهُ من النور مابين الجمعتين، رواه ابن ماجه والحاكم والبيهقي وصححه الالباني في صحيح الجامع.

واتە: هەریەكێك سورەتی (كهف) بخوێنێ لەرۆژی هەینیدا نێوانی هەردوو

هەینیەکەی بۆ رۆشن دەبێتەوە.

لە فەرموودەیەکی تر کە (دارمی) ریوایەتی کردووە ئەلبانی لە (صحیح الجامع)دا دەڵێ فەرموودەیەکی (صحیح)ە لە ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: واتە: هەریەکێك شەوی هەینی سورەتی (کهف) بخوێنێ نێوانی خۆی و کەعبەی بۆ رووناك دەبێتەوە.

٤- عن ابي الدرداء (رضي الله عنه) أنَّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: (مَنْ حَفِظَ عشرَ آياتٍ من أوَّلِ سورةِ الكهفِ، عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ) وفي روايةٍ (من آخر سورة الكهف) رواه مسلم.

واتە: هەریەکێك (١٠) ئایەت لەسەرەتای سورەتی (کهف) لەبەربکات دەپارێزرێ لە دەججال. وە لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: لە کۆتایی سوورەتی (کهف).

ئەمەش بەم شێوە دەبێت هەرکاتێك کە دەججالت بینی ئەم (١٠) ئایەتەی بەسەردا دەخوێنیەوە ئەوکاتە ناتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ

٥- عن جابر (رضي الله عنه) أن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) كان لاينامُ حتى يقرأ ﴿الم تنزيل﴾ و ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي.

واتە: جابر (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەدەخەوت تاوەکو سورەتی (سجدة) و (مُلك)ی نەخوێندبایەوە.

یەکێك لەو شتانەی کە موسڵمان بەهۆیەوە دەربازی دەبێت لەسزای گۆڕ، خوێندنی سورەتی (ملك)ە واتە: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾.

عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: من قرأ (تبارك الذي بيده الملك) كلَّ ليلةٍ منعَهُ الله عزّ وجل بها من عذاب القبر) رواه النسائي واللفظ له والحاكم وقال صحيح الأسناد.

واتە: (عبدالله)ی کوڕی مسعود (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هەریەکێك هەموو شەوێ ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ بخوێنێ، خودا بەهۆی خوێندنی

مەنعی دەكات لەسزای ناو گۆڕ.

وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەفەرموودەیەكدا كە ئەلبانی دەڵێ (صحيحه) دەفەرمووێ (سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر) واتە: خوێندنی سورەتی (تبارك) ڕێگرە لەسزای گۆڕ.

وە دەفەرمووێ (من القرآن سورة ثلاثون آية شفعت لرجل حتى غُفر له وهي تبارك الذي بيده الملك)[1]

ئەگەر ئەم سورەتە لەبەر بكرێ خوێندنەوەكەی ئاسانتر دەبێت، هەموو شەوێ داوا لەخوا دەكەم كەیارمەتی دەرمان بێت بۆ هەموو كارێكی چاكە.

٦- عن عبد الله بن خبيب (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (اقرأ: قل هو الله احد والمعوّذتين حين تمسي وحين تصبح ثلاث مرات تكفيك من كلّ شيء) رواه ابو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

واتە: (عبدالله)ی كوڕی خوبەیب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: كاتێك كە ئێوارە دەكەیتەوە وە كاتێكیش كە بەیانی دەكەیتەوە، سێ جاران سورەتی (إخلاص و فلق و ناس) بخوێنە بۆ پارێزران لەزیانی هەموو شتێك بەسە.

ئەم زیكرە لەبەیانیان و ئێواران دەكرێ، بەیانیان كاتەكەی دەكەوێتە نێوانی بانگی بەیانی و ڕۆژهەڵات، ئێوارانیش كاتەكەی دەكەوێتە نێوانی عەسرو ڕۆژئاوابوون.

٧- عن ابن عمر (رضي الله عنه) قال: رمقْتُ النبيَّ (صلى الله عليه وسلم) شهراً وكانَ يقرأ في الركعتين قبل الفجر (قل يا أيها الكافرون) وە (قل هو الله أحد) رواه الترمذي وقال حديث حسن وابن حبان في صحيحه.

---

(١) رواه ابو داود والترمذي وقال حديث حسن وصححه ابن حبان والحاكم ووافقه الذهبي.

واتە: (عبدالله) کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: ماوەی مانگێك چاوم بڕیبووە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەدوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی سبەینێ (قل یا أیها الکافرون) وە (قل هو الله احد)ی دەخوێند.

٨- عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) قال: امرني رسول الله (صلی الله علیه وسلم) (أن اقرا بالمعوذات في دبر كلّ صلاة) حديث صحيح رواه ابو داود والترمذي والنسائي.

واتە: عوقبەی کوڕی عامر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردم کە سورەتی (اخلاص) و (فلق) و (ناس) بخوێنم لەدوای هەموو نوێژێك.

٩- عن الحارث بن جبلة قال: قُلْتُ یا رسول الله علمني شيئاً اقولُهُ عند منامي، قال:(اذا اخذت مضجعك من الليل فاقرا ﴿قُلْ يا أيُها الْكافِرُونَ﴾ فإنها براءة من الشرك) حديث حسن رواه الأمام أحمد في (المسند) (٢٧٨٩٤).

واتە: (حارث بن جبلة) دەڵێ گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێربکە لەکاتی نوستندا بیڵێم، فەرمووی: ئەگەر شەو چوویە ناو جێگای نووستن ﴿قُلْ يا أيُها الْكافِرُونَ﴾ بخوێنە، چونکە بێ گومان ئەم سورەتە بەریبوونە لە هاوبەش (شرك).

١٠- عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: كان رسول الله (صلی الله علیه وسلم) يصومُ حتى نقولَ: ما يريد ان يفطر، ويُفطر حتى نقول: ما يريد ان يصوم، وكان (صلی الله علیه وسلم) يقرا في كل ليلة بني اسرائيل والزمر. حديث صحيح رواه النسائي (٢٣٤٧)

واتە: عائشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڕۆژوو دەبوو تاوەکو دەمانگوت نایەوێ بەڕۆژوو نەبێت، وە بەڕۆژووش نەدەبوو ماوەی وا هەبوو تاوەکو دەمان گوت نایەوێ بەڕۆژوو

بێت، وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموو شەوێك سورەتی (اسراء) و (زمر)ی دەخوێند.

## گەورەیی خوێندنی سورەتی (إخلاص) و ماناکەی

١- عن ابي سعيد الخدريّ (رضي الله عنه) ان رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قال: في (قل هو الله احد) (والذي نفسي بيده) إنها لتعدلُ ثلثَ القرآن) رواه البخاري.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی (قل هو الله احد) فەرمووی: سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە، بێ گومان (قل هو الله احد) یەکسانە بە سێیەکی قورئان.

واتە پاداشتی خوێندنەکەی بەرامبەر سێیەکی قورئانە، یانی هەریەکێك یەك جار (قل هو الله احد) بخوێنێ خێری خوێندنی (١٠) جزء قورئانی بۆ دەنووسرێ.

٢- عن ابي الدرداء (رضي الله عنه) عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال: (ايعجزُ احدكم ان يقرا في ليلة ثلث القرآن) قالوا: وكيف يقرا ثلث القرآن؟ قال: (قل هو الله احد) تعدلُ ثلثَ القرآن، رواه مسلم.

واتە: ئەوە یەکێك لەئێوە ناتوانێ لەشەوێکا سێیەکی قورئان بخوێنێ، وتیان: جا سێیەکی قورئان چۆن دەخوێندرێت؟ فەرمووی: (قل هو الله احد) بەرامبەر سێیەکی قورئانە.

٣- عن معاذ بن انس الجهني (رضي الله عنه) عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: من قرأ: قل هو الله احد، حتى يختمها عشر مرّات بنى الله لَهُ قصراً في الجنة، اخرجه احمد والدرامي والطبراني وصححه الالباني.

واته: هەریەکێك (١٠) جار (قل هو الله احد) بخوێنێ تا تەواوی دەکات خودا (قصر)ەکی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات، ئەوەی (٣٠) جار بیخوێنێ سێ (قصر)ی بۆ دروست دەکرێ، وە هەروەها.

# ماناى سوورەتى (إخلاص)

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوى خواى بەبەزەیى و بەخشندە.

(قل هو الله احد) بڵێ: ئەوە خواى تاك و تەنیا، یان بەمشێوە: ئەى پێغەمبەر بڵێ: ئەو خوایەى كەناوى (الله)یە یەكتایە لەهەموو روویەكەوە.

(الله الصمد) خودا (المقصود في الحوائج كلها) واتە: رووى تێ دەكرێ بۆهەموو پێداویستییەكان.

وە گوتراوە (الصمد): (هو المستغنى عن كل احد والمحتاج إليه كل احد) واتە: ئەو پێویستى بەكەس نییە، وە هەموو كەسیش پێویستیان بەئەوە.

(لم يلد ولم يولد) كەسى لێ نەبووەو لەكەس نەبووە

(ولم يكن له كفواً احد) وە هیچ كەس هاوشێوەو هاوتاى نییە

لەكۆتاییدا دەڵێم:

١- خێرى خوێندنى سورەتى (إخلاص) بۆ قورئان خوێن و بۆ ئەوانەشە كەنازانن قورئان بخوێنن.

٢- ئەوانەى نەخوێندەوارن و ناتوانن قورئان فێربن و وە خۆزگەش دەخوازن ئەگەر قورئانیان بزانیبایە، با ئەوانە فێربكرێن و هانبدرێن كە زۆر سورەتى (إخلاص) بخوێنن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: (من دلّ على خيرٍ فلهُ مثل اجر فاعله) رواه مسلم.

# سوورەتی ( فلق ) و ( ناس ) و ماناکەی

١- عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) انّ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قال: الم تر آياتٍ أُنزِلَتْ هذهِ الليلة لم يُر مثلُهنّ قطُ قُل اعوذ بربّ الفلق وقل اعوذ بربّ الناس) رواه مسلم.

واتە: ئایا نابینیت هەندێ ئایەت ئەم شەو نێرراونە خوارەوە قەت شتی وا نەبینراوە (قل اعوذ برب الفلق) وە (قل اعوذ برب الناس)

٢- عن ابي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: (كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يتعوذ من الجانّ وعين الإنسان حتى نزلت المعوّذتان، فلما نَزَلتا، اَخَذَ بهما وترك ما سواهما).

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی دەپاراست لە جنۆکەو چاوی ئادەمیزاد تا سورەتی (فلق) و (ناس) هاتنە خوارەوە، جا کاتێك ئەم دوو سورەتە هاتنە خوارەوە دەستی پێوەگرتن و وازی لە جگە لەم دووە هێنا.

مانای سوورەتی (فلق):

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای بەبەزەیی و بەخشندە.

(قل اعوذ برب الفلق) (ئەی محمد، صلى الله عليه وسلم) بڵێ: خۆم دەپارێزم بە دروستکەری بوونەوەر.

الفلق: الصبح، وقيل: جميع المخلوقات.

ئەگەر (الفلق) بە (الصبح) لێك بدەینەوە مانای ئایەتەکە وای لێدێت:

(بڵێ: خۆم دەپارێزم بەپەروەردگاری بەیان).

(من شر ما خلق) لەزیانی ئەوەی کە دروستی کردووە.

(ومن شر غاسقٍ اذا وقب) وە لەزیانی تاریکی کاتێك کە دابێ.

عن مجاهد: قولهُ (غاسقٍ) قال: الليل (اذا وقب) قال: اذا دخل، واتە: (مجاهد) دەڵێ (غاسق) واتە: شەو (اذا وقب) واتە: کاتێك کە بێت.

شەو: کاتەکەی دەست پێ دەکات لە رۆژئاوابوونەوە تا بانگی بەیانی.
(ومن شر النفاثات في العقد) وە لەزیانی فووکەران (جادووکەران) بەگرێیاندا.
النفاثات: (النفاثة) سیغەی موبالەغەیە، بۆ نێرو مێ دەگوترێ. کۆیەکەی (النفاثات)ە.
العقد: کۆی (عقدة)یە واتە: گرێ.
(ومن شر حاسدٍ اذا حسد) وە لەزیانی حەسوود کاتێک کە حەسوودی بیات.

## ماناى سوورەتی (ناس)

(بسم الله الرحمن الرحیم) بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە.
(قل اعوذ بربِ الناس) (ئەی موحەمەد، صلی الله علیه وسلم) بڵێ: خۆم دەپارێزم بەپەروەردگاری خەڵکی.
(ملك الناس) پادشای خەڵکی (إله الناس) پەرستراوی خەڵکی.
(منْ شر الوسواس الخناس) لەزیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهانکەر.
(قتادە) دەڵێ: (الوَسْواس) واتە: شەیتان.
(الخناس) الذي يختبيء ويرجع، واتە: ئەوەی خۆی دەشارێتەوەو دەگەڕێتەوە، شەیتان کاتێک ئینسان یادی خوا بکات خۆی دەشارێتەوە کاتێک کە بێ ئاگا بوو دەست دەکات بە وەسوەسە.
(الذي يوسوس في صدور الناس) ئەوەی کە وەسوەسە دەکات لەدڵی خەڵکیدا.
(من الجنة والناس) لەجنۆکەو لەئادەمیزاد.

## کۆمەڵێ فەرموودەی ( موضوع ) و ( ضعیف )

ئەم کۆمەڵە فەرموودەیە بۆیە لێرەدا هێناومە بۆئەوەی موسڵمان لەسەر بینایی و ڕێی ڕاست کارەکانی ئەنجام بدات، چونکە ( احکام ) لەسەر فەرموودەی (ضعیف) و (موضوع) دانامەزرێ، بۆ نموونە ئەگەر فەرموودەیەکی (ضعیف) هەبوو دەربارەی چاکەی خوێندنی سوورەتێك لەکاتێکی دیاریکراودا، ئەوە ناکرێ بڵێی ئەم سوورەتە خوێندنی لەم کاتەدا سوننەتە، چونکە گوتمان (احکام) بەفەرموودەی (ضعیف) و (موضوع) دانامەزرێ، سوپاس بۆ خوا عیبادەتەکان ئەوەندە زۆرن ئەگەر ڕۆژانە بیست و چوار کاتژمێر خەریکی بیت کۆتایی نایەت، ئێمە هیچ پێویستیەکمان بەداهێنراو (بدعة) نییە، پێویستە موسڵمان کاتێك کە عیبادەتێك دەکات ئەم عیبادەتە بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر هەبێت و داهێنراو (بدعة) نەبێت ئینجا بیکات.

١- عن انس (رضي الله عنه) قال: قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (إن لكل شيءٍ قلباً وقلب القرآن (يس) ومن قرأ (يس) كتب الله له بقراءتها قراءة القرآن عشر مرات) حديث موضوع.

٢- جندب بن عبدالله (رضي الله عنه) قال: قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (من قرأ (يس) في ليلة ابتغاء وجه الله عز وجل غفر له) حديث ضعيف.

٣- عن معقل بن يسار (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (اقرأوها على موتاكم) يعني: (يس) حديث ضعيف.

٤- عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (من قرأ حم الدخان في ليلة اصبح يستغفر له سبعون الف ملك) حديث ضعيف.

٥- عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله

عليه وسلم): (من قرأ (حم الدخان) في ليلة الجمعة غفر له) حديث ضعيف.

٦- عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: (من قرأ سورة الواقعة كل ليلة لم تصبه فاقة ابدا) حديث ضعيف.

٧- عن انس قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (من قرأ (اذا زلزلت) عدلت له بنصف القرآن) حديث ضعيف.

٨- عن انس بن مالك: ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم): قال لرجل من اصحابه (هل تزوجت يافلان) قال: لا والله يا رسول الله ولا عندي ما اتزوج، قال: (اليس معك (قل هو الله احد) قال: بلى، قال: ثلث القرآن، قال: اليس معك (اذا جاء نصر الله والفتح) قال: بلى، قال: ربع القرآن، قال: اليس معك (اذا زلزلت الأرض) قال: بلى، قال: ربع القرآن، تزوج) حديث اسناده ضعيف.

## نیازپاکی و ڕێبازی لەقورئان خوێندندا

ئێمە بۆئەوەی لەقیامەتدا پاداشت لەسەر چاکەکانمان وەربگرین دەبێ چوار شتمان تێدا بێتەجێ:

١- دەبێ بڕوادار بین، چونکە ئەگەر بڕوادار نەبین لەقیامەتدا سوود لەکردەوەو چاکەکانمان وەرناگرین.

٢- دەبێ ئەوکارەی کەدەیکەین بەڵگەیەکی شەرعی لەسەربێت کەئەمە کارێکی چاکەو داهێنراو (بدعة) نییە.

٣- دەبێ لەکردنی کارە چاکەکەدا مەبەستمان تەنها خودا بێت.

٤- دەبێ بەئیمان داریش بمرین، چونکە ئەگەر تۆ لەسەرەتای ژیانت بڕوادار بوویت و کاری چاکەت زۆر کرد بەڵام لەکۆتاییدا بەکافری مردی ئەوە کردەوەکانت هەمووی ڕەش دەبێتەوە.

جا ئەوکەسەی کەدەیەوێ پاداشت لەسەر قورئان خوێندنەکەی وەربگرێ دەبێ تەنها لەبەر خوا بیخوێنێ، موسڵمان ئەگەر بیەوێ بەهۆی ڕیابازییەوە پلەو پایە بەدەست بێنێ لەدڵی خەڵکا ئەوە بەهەڵە داچووە، ڕێز و قەدری ئادەمیزاد بەختەوەری ئادەمیزاد لەدونیاو لەقیامەت بەهۆی تەقوایە، بێ ڕێزی و بەدبەختیشی لەدونیاو لەقیامەتدا بەهۆی تاوان و گوناهە.

جا بابزانین ئەوانەی لەدونیادا قورئانیان خوێندووە بۆئەوەی پێیان بڵێن قورئان خوێنە بەچی دەگەن لەقیامەتدا.

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: (إنَّ أوّلَ الناس يُقضى يوم القيامة عليه رجل استشهدَ، فأُتيَ به، فعَرَّفَهُ نعمته، فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استُشهدتُ، قال كذبت، ولكنكَ قاتلت لأن يُقال جريٌ! فقد قيلَ، ثمَّ امر به، فَسُحِبَ على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجلٌ تعلمَ العلم وعلّمَهُ، وقرا القرآن، فَأُتيَ به، فعَرَّفَهُ نعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمتهُ، وقرأتُ فيك القرآن، قال: كذبتَ، ولكنك تعلمت ليقال: عالم، وقرأت القرآن ليقال هو قارِيءٌ! فقد قيل، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فسحب على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجل وسَّعَ الله عليه، واعطاهُ من اصناف المال، فأُتيَ به فعرفَهُ نِعَمَهُ، فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: ماتركت من سبيل تُحبُّ أن يُنفقَ فيها إلاّ انفقتُ فيها لك، قال: كذبت، ولكنّك فعلت ليقال: هو جوادٌ! فقد قيل، ثُمَّ أمر بِهِ فَسُحِبَ على وجهه ثمَّ أُلقِيَ في النار. رواه مسلم.

فَأُتيَ به: (جاءت به الملائكة يوم القيامة) فریشتە دەیهێنن

لەقیامەت.

جریء: ئازا.

جواد: سەخی.

واتە: یەکەم کەس کە لەرۆژی قیامەتدا مەحکەمە دەکرێ و حوکم دەدرێ پیاوێکە شەهیدکراوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی یەکە یەکە بیردەخاتەوە ئەویش یەك بەیەك پێیان لێ دەنێ.

جا خوا دەفەرموێ: لەجیاتی ئەو چاکانە تۆ چی کارێکی باشت کردووە؟

دەڵێت: لەپێناوی تۆدا جەنگاوم هەتا شەهید کراوم، دەفەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆئەوە جەنگاویت کە بڵێن ئازایە، وە ئەمەش گوترا.

پاشان فەرمان دەکرێت لەسەر روو رادەکێشرێت هەتا فڕێ دەدرێتە ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێك فێری زانیاری بووەو خەڵکی فێر کردووەو قورئانی خوێندووە دەیهێنن، خودا چاکەکانی دەخاتەوە بیری ئەویش پێیان لێ دەنێ.

دەفەرمووێت: تۆ لەجیاتی ئەمانە چی کارێکی باشت کردووە!

دەڵێت: زانست فێربووم و خەڵکیشم فێرکردو لەبەر رەزامەندی تۆ قورئانم خوێند.

خوا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵکو تۆ بۆیە فێری زانین بووی تا بڵێن زانایە، وە بۆیە قورئانیشت خوێندووە تا بڵێن قورئان خوێنە، وە ئەم قسەش گوترا

پاشان فەرمان دەکرێت و لەسەر رووی رادەکێشرێت هەتا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێك کە خودا لەدونیادا داراو دەوڵەمەندی کردووەو لەهەموو چەشنە ماڵێکی پێ داوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی وەبیر

دەخاتەوە ئەویش پێیان لێ دەنێ.

خودا دەفەرمووێت: چیت پێ کردن.

دەڵێت: هیچ ڕێگەیەکم نەهێشتەوە کەتۆ پێت خۆش بێت تیایدا ببەخشرێتەوە، ئیللا بەخشیمەتەوە تیایدا لەبەر تۆ. خودا دەفەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆیە وات کرد تا بڵێن سەخییە، وە ئەم قسەیەش گوترا.

پاشان فەرمان دەدرێت و لەسەر ڕووی رادەکێشرێت و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (ومَن قرأ القرآن فليسأل الله به فإنه سيجيء أقوام يقرؤون القرآن يسألون به الناس)[1]

واتە: هەریەکێك قورئانی خوێند با داوای پێبکات لەخوا چونکە لەداهاتوودا خەڵکانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن و بەهۆیەوە داوا لەخەڵکی دەکەن.

(١) رواه الترمذي و احمد والطبراني والبيهقي عن عمران بن حصين و صححه الالباني في السلسلة الصحيحة (٢٥٧).

## دابەزینی قورئان

لەرۆژی دووشەمە لە حەڤدەی رەمەزان، ساڵی (٤١) لەدایك بوونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەئەشکەوتی (حراء) سرووش (وحي) دەستی پێکرا بۆ پێغەمبەر بەهۆی جبریل.

یەکەم بەش کە دابەزی لەقورئان ئەم پێنج ئایەتە بوو لە سوورەتی (علق) کە خوا دەفەرمووێ:

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ۝ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ۝ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝﴾ (سورة العلق).

وە کۆتا بەش کەلە قورئان دابەزی لەقسەی (ارجح) ئایەتی (٢٨١) بوو لەسوورەتی (بقرة) کە خودا دەفەرمووێ ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ۝﴾ ئەوەش پێش نۆ رۆژ بوو لەوەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

## نووسین و کۆکردنەوەی قورئان

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نووسەری زۆری هەبووە لەهاوڕێکان وەك ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و زوبێری کوڕی عەووام و (ابی) کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت و گەلێکی تر کە لەمەدینە ژمارەیان گەیشتۆتە (٤٣) کەس خوایان لێ رازی بێت، بەڵام زیاتر

پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) زەیدی کوڕی ثابتی بانگ کردووە چونکە گەنجێکی زیرەك و وریاو خەت خۆش بووە.

لەو زەمانەدا کاغەز نەبووە بۆیە ئایەتەکانی قورئان لەسەر پێستی مامز و لقی دار خورما و شتی تر نووسراون، وە ئەمانەشیان لەماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هەڵدەگرت کە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) وەفاتی کرد، بەم جۆرەی کە وتمان قورئانێك لەماڵی پێغەمبەردا هەبوو.

تا لەجەنگی (یمامە)دا حەفتا کەس لەوانەی کەهەموو قورئانیان لەبەربوو کوژران، جا ئەبوبەکر و عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) لەمە ترسیان لێ نیشت، لەبەر ئەوە بڕیاریاندا قورئان هەمووی لەیەك کتابدا کۆبکەنەوە بەریزکراوی، بۆئەمەش ابوبکر فەرمانی دا بە زەیدی کوڕی ثابت کە نووسەری سرووش (وحی) بوو، هەموو قورئانی لەبەربوو بەم کارە هەڵسێ، جا زیدیش هەر ئایەتێك کە دوو کەس شایەتی بدابایە کەلە دەمی پێغەمبەریان بیستووە دەینووسیەوە، بەم رەنگە سی جزمی قورئانیان بەریزکراوی لەماوەی ساڵێکدا نووسیەوەو کۆکردەوە لەکتابێکی گەورە لە پێستی مامز.

لەپاشان ئەو نوسخە قورئانەیان لەلای ئەبوبەکر دانا دوای ئەو لای عومەر، دوای ئەو لای (حفصە)ی کچی بوو کە خێزانی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیە وسلم) جا ئەو کاتانەش کەس پێویستی بەم قورئانە نەبووە چونکە هەزاران کەس قورئانیان لەبەربوو.

جا ئەو نوسخە قورئانە لای (حفصە) مایەوە تا لەکاتی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان (رەزای خوای لێ بێت) دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو، خەڵك زۆر هاتنە ناو بازنەی ئیسلام، بەمجۆرە دووبەرەکیەك پەیدا بوو لەناو موسڵمانان، لە خوێندنەوەی هەندێ وتەی قورئان، ئەمەش گەیشتەوە بەئیمام عثمان، ئەویش خێرا لێژنە (لجنە)یەکی دروست کرد

لە دوانزە کەس لە پیاوانی گەورەی کۆچکەران (مهاجرین) و یارمەتی دەران (انصار) بە سەرۆکایەتی زەیدی کوڕی ثابت وە بەچاودێری خۆی، ناردیان ئەم قورئانەیان هێنا کەلەلای (حفصە) بوو چوار وێنەیان لێ وەرگرتەوە، ئیمام عوسمان سەرو دانەی نارد بۆ مەککەو کوفەو بەسراو شام، وە ئەمە لەساڵی (٣٠)ی کۆچی دابووە.

بەکورتی کۆکردنەوەی قورئان سێ جار بووە:

یەکەم: لەکاتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)

دووەم: لەکاتی خەلافەتی ئیمام ئەبوبەکر هەموو قورئان بەریزکراوی لەسەر دەفتەرێکی گەورە لەپێستی مامز لەسەرەوە تاخوار نووسرایەوە وەك قورئانی ئەمڕۆ.

سێیەم: لەزمانی ئیمام عوسماندا، چوار نوسخەی لەسەر ئەم قورئانە گرتەوە، کەلە سەردەمی ئیمام ئەبوبەکر نووسرابۆوە، تا موسڵمانان وێنەی لێ بگرنەوەو دووبەرەکی نەکەون، وەبەمە ئیمام عوسمان هەموو شێوەکانی قورئانی کرد بەیەك شێوە کەشێوەی قورەیشە.

لەکۆتاییدا دەڵێم ریزکردنی ئایەت و سوورەتەکانی قورئان بەمجۆرەی کە ئێستاهەیە هەمووی بەفەرموودەی پێغەمبەر بووە (صلی الله علیە وسلم).

# قورئان بە حەوت شێوە هاتۆتە خوارەوە

عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) قال: سمعتُ هشام بن حكيم بن حزام (رضي الله عنه) يقرأ سورة الفرقان على غير ما أقرؤها، وكان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أقرأنيها فكدت أن أعجل عليه، ثمّ أمهلْتُهُ حتى انصرف، ثمّ لبّبْتُهُ بردائه فجئتُ به رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) فقلتُ يا رسول الله، اني سمعتُ هذا يقرأ سورة الفرقان على غير ما أقرأتنيها، فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أرسلْهُ اقرأ فقرأ القراءة التي سمعتُهُ يقرأ، فقال رسول الله (ﷺ) هكذا انزلت، ثمّ قال لي إقرأ، فقرأت، فقال هكذا انزلت، إنّ هذا القرآن انزل على سبعة أحرف، فاقرءوا ماتيسر منه. رواه البخاري ومسلم.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: گوێم لێبوو (هشام)ی کوڕی (حكيم)ی کوڕی (حزام) (ڕەزای خوای لێ بێت) سوورەتی (الفرقان)ی دەخوێند، جیاواز لە خوێندنی من، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی بۆی خوێندبووم، خەریك بووم پەلە بکەم خوێندنەوەکەی پێ ببڕم، بەڵام مۆڵەتم دا تا لێ بووەوە، پاشان بەرۆکیم گرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا من گوێم لەمەبوو سورەتی (فرقان)ی خوێندەوە جیاواز لەوەی کەتۆ بۆمنت خوێندووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەریدە، بیخوێنەوە، ئەویش هەر بەوشێوە خوێندی کەمن لێم بیستبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەمشێوە دابەزیوە، پاشان بەمنیشی فەرموو: بیخوێنە، منیش خوێندمەوە، فەرمووی: بەمشێوە دابەزیوە، ئەم قورئانە لەسەر حەوت پیت دابەزیوە، ئێوەش ئەوەندەی بۆتان دەکرێ بیخوێننەوە.

جا کاتێك کە قورئان هاتە خوارەوە شێوەی قسەکردن زۆر بوو لەمەککە و دەوروبەریدا، وەك شێوەی (قریش) و (قیس) و (تمیم) و (اسد)

و (خزاعه) و (كنانه).

جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر خۆی لەقورەیش وە شێوەی قسەکردنی قورەیشی بوو، وە شێوەی قورەیشیش لەهەموو شێوەکانی تر رەوانتربوو، قورئان بەشێوەی (قریش) هاتە خوارەوە، بەلام لەبەرئەوەی کەگران بوو لەسەر تیرەکانی تر خوێندنەوەی قورئان بەشێوەی قورەیش رێ درا، کە هەرکەسە بەشێوەی خۆی دەوری قورئان بکاتەوە، وە هەر تیرەیەك قورئانی وەرگرت لەدەم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەی خۆی، وە هەموو تیرەیەك قورئانی دەخوێند بەو شێوەیەی کەلای ئاسان بوو.

ئەوە مایەوە تا زەمانی ئیمام عثمان (رەزای خوای لێ بێت) ئەو هەموو شێوەکانی قورئانی کرد بەیەك شێوە کەشێوەی قورەیش بوو، وەك وتمان چوار نوسخەیان نووسیەوە و دابەشیان کرد بەسەر مەککە و کوفە و بەسرا و شامدا بۆئەوەی لەسەر ئەم قورئانانە قورئان بنووسنەوە و هەمووی ببێتە یەك شێوە.

## خوێنەرانی قورئان و خوێندنەوەکان

حەوت قورئان خوێن هەبوون لەکاتی خۆی ئەم حەوت قورئان خوێنە خوێندنەوەکانیان بە (تواتر) بەدەست موسڵمانان گەیشتووە کە ئەمانەن:

١- نافع المدنی (٧٠-١٦٩)ك ژیاوە.

٢- ابن كثير المكی التابعی (٤٥-١٢٠)ك ژیاوە.

٣- ابو عمرو البصری (٦٨-١٥٤)ك ژیاوە.

٤- ابن عامر الشامی (١٥٣-٢٤٥)ك ژیاوە.

٥- عاصم الكوفی (٩٠-١٨٠)ك ژیاوە.

٦- حمزه الكوفی (٨٠-١٥٦)ك ژیاوە.

٧- الكسائی الكوفی (١١٩-١٨٩)ك ژیاوە.

وە سێ قورئان خوێنی تریش هەن دراونە پاڵ ئەم حەوتە کە ئەمانەن

(ابو جعفر المدني) (يعقوب البصري) (خلف بن هشام البغدادي) بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر (تواتر)ی خوێندنەوەکانیان.

جگە لەم (١٠) قورئان خوێنە زۆری تریش هەن، بەڵام ئەمانە زیاتر ناوبانگیان پەیدا کردو جۆری خوێندنەوەکانیان زیاتر بڵاوبۆوە، هۆی ئەم جیاوازیەش لە خوێندنەوەی قورئان خوێنەکان ئەوەیە کە هەر هۆزەو ناوچە بەپێی زاراوەکەی خۆی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی بۆ خوێندوونەتەوە.

جا قورئان خوێن بۆی هەیە بەهەر یەکێك لە خوێندنەوەی ئەم (١٠) قورئان خوێنە قورئان بخوێنێ، بەڵام لەسەریەتی کەتێکەڵی نەکات بەخوێندنەوەکانی تر، واتە بەیەك لەم (١٠) خوێندنەوانە بیخوێنێ.

جگە لە خوێندنەوەی ئەم (١٠) قورئان خوێنە، خوێندنەوەکانی تر (شاذ)ن دەخوێنرێن، بەڵام کاریان پێ ناکرێ.

جا ئەم جۆرە خوێندنەوەی کە ئەمڕۆ لەکوردستان و لە زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهانی ئیسلامی بڵاوبۆتەوە خوێندنەوە (قراءة)ی (عاصم)ە بەریوایەت لێکردنی (حفص) وە هەندێك لە خوێندنەیوەکانی تر لەوڵاتانی لیبیا و تونس و مەغریب و جەزائیر و سودان و یەمەندا هەیە.

(عاصم) ناوی (ابو بكر عاصم بن ابي النجود)ە یەکێکە لە تابیعیەکان، دەنگێکی زۆر خۆشی هەبووە لەقورئان خوێندن، قورئانی وەرگرتووە لە (ابو عبدالرحمن السلمي) ئەویش لە (علي بن ابي طالب) ئەویش لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

وە هەروەها لە (علي زر بن حبش) لەئەویشی وەرگرتووە، ئەویش لە (عبدالله بن مسعود)ی وەرگرتووە، ئەویش لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

وە (حفص) هاوڕێی (عاصم) بووە، یەکێك بووە لەو کەسە دیارانەی کە قورئانی لە (عاصم) وەرگرتووە.

**(الحرز) وە (طيبة النشر):**

ئەم دووە دوو کتاب و دوو رێگان کەلەسەر ڕیوایەتی (عاصم عن حفص) نووسراون.

(الحرز) ئەوە کتابی (حرز الأماني ووجه التهاني)یە کەناسراوە بە (الشاطبية) لەدانانی ئیمام (قاسم بن فیرە الشاطبي الاندلسي)یە، (شاطبي) لەساڵی (٥٩٠)ك وەفاتی کردووە لە قاهیرە نێژراوە.

(طيبة النشر) ئەم کتابە دانراوی (محمد بن الجزري)یە لە دمشق لەدایك بووە لە (٧٥٠)ك، لەشیراز وەفاتی کردووە لەساڵی (٨٣٣)ك.

# مەككی و مەدەنی

قورئان یەكەم جار لە مەككە هاتۆتە خوارەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیـە وسلم) (١٢) سـاڵ و (٥) مـانگ و (١٣) رۆژ لـە مەككـەدا مایـەوە لەپاشان كۆچی كرد بۆ مەدینـە، ئینجا هەرچی قورئـان لـەو ماوەیـەدا هاتبێتە خوارەوە پێی دەڵێن (مكّي) ئیتر چ لە مەككە هاتبێتە خوارەوە یا لە دەوروبەری.

وە هەرچیش لەدوای گەیشتنی بە مەدینە هاتبێتە خوارەوە پێی دەڵێن (مدني) ئیتر چ لـە مەدینـە هاتبێتـە خوارەوە یا لـە دەوروبـەری، قورئـان (١١٤) سـوورەتە (٢٣)یـان مـەدەنین، ئـەوانیتر مـەككین، مـەدەنی یەكانی هەرچەندە بەژمارە كەمترن بەڵام زیاتری قورئان مەدەنی یە.

# حوکمی هەڵگرتنی قورئان بەبێ دەستنوێژ

قورئان خوێندن لەبەر جائزە بەبێ دەست نوێژ لەسەر قسەی هەموو زانایان هەتا ئەوانەش کەدەڵێن واجبە دەستنوێژ هەبوون بۆ دەستدانە قورئان.

بەڵام دەست دانە قورئان و هەڵگرتنی بەدەستنوێژ ئەوە ئیمام مالك و شافیعی و ئەحمەد (رەحمەتی خوایان لێ بێ) دەڵێن: واجبە بە دەستنوێژ بێت، بەڵام غەیری ئەوان بەواجبی نازانن.

جا لەم سەردەمەی ئێمەدا هەندێ لەلێکۆڵەرەوان کەلەم بابەتەیان کۆڵیتەوە دەڵێن: جائزە دەست لێدان و هەڵگرتنی بەبێ دەستنوێژ، ئەو بەڵگانەی کە ئەوانەی دەڵێن دەست دانە قورئان بە دەستنوێژ بێت، یەکەم ئەوەیە کە خوا دەفەرمووێ ﴿لا يَمَسُّهُ إلا الْمُطَهَّرُونَ﴾ جا ئەوان لەوەڵامدا دەڵێن وشەی (المطهرون) (أرجح) وایە مەبەست پێ فریشتە بێت نەك ئادەمیزاد.

دووەم بەڵگەیان ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) لەو کتابەی کە بۆ خەڵکی یەمەنی نارد تێیدا فەرمووی: (لا يمس القرآن إلا الطاهر) ئەوانیش لەوەڵامدا دەڵێن وشەی (طاهر) لێرەدا (أرجح) وایەمەبەست پێ موسڵمان بێت وشەی (طاهر) بەرامبەر (نجس)ە کە وەسفی کافرانی پێ دەکرێ، خوا دەفەرمووێ ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ ئەم بابەتە بەکورتی خراوەتە روو.

لەکۆتاییدا دەڵێم با موسڵمان هەوڵ بدات تا بۆی دەکرێ بە دەستنوێژەوە قورئان بخوێنێ جا لەسەر قورئان بوو یا لەبەر دەیخوێند، چونکە ئەگەر لەبەریش بیخوێنێ هەر (مستحب)ە کە دەستنوێژی هەبێت.

# سەجدەی خوێندنی قورئان

لەلای زۆربەی هەرە زۆری زانایان سوننەتە کە قورئان خوێن لە نوێژو غەیری نوێژیشدا هەروەها ئەو کەسانەی کەلە دوایەوە نوێژ دەکەن، ئەگەر ئیمام بوو، یان ئەوانەی کە گوێی لێ دەگرن ئەگەر لەغەیری نوێژدا بوو، لەکاتی خوێندنی یەکێك لەو ئایەتانەدا کە بەئایەتی سەجدە ناسراون سەجدە بەرێ.

عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال: (ان النبيّ (صلى الله عليه وسلم) كان يقرا القرآن، فيقرا سورة فيها سجدة، فيسجدْ ونسجدْ معه، حتى مايجد بعضنا موضعاً لمكان سجْدته) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك قورئانی دەخوێند جاری وابوو سوورەتێکی دەخوێند کە سەجدەی تێدابوو، جا ئەو سەجدەی دەبرد و ئێمەش سەجدەمان لەگەڵ دەبرد، هەتا جاری وابوو هەندێکمان شوێنی سەجدە لەسەر بردنمان دەست نەدەکەوت.

بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سورەتی (نجم)ی خوێندووە سەجدەی بردووە.

هەروەها (زيد بن ثابت) (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە کە سوورەتی (نجم)ی بەسەر پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) خوێندووە و سەجدەی نەبردووە، رواه البخاري ومسلم.

وە هەروەها (بخاری) گێڕاویەتیەوە کە (عمر بن الخطاب) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەرۆژی هەینیدا سوورەتی (النحل)ی لەسەر مینبەرداخوێندووەو هەتا گەیشتۆتە شوێنی سەجدە ئەوجا دابەزیوەو سەجدەی بردووە و خەڵکیش سەجدەیان بردووە لەگەڵیدا، بەڵام بۆ جومعەی داهاتوو هەمان سوورەتی خوێندووەو لەشوێنی سەجدەش سەجدەی نەبردووە ئەوجا بەخەڵکەکەی گوتووە: ئەی خەڵکینە ئێمە فەرمانمان پێ نەکراوە

سەجدەی قورئـان خوێنـدن بەرین جا هەرکەس سەجدەی بردووە پێکاویەتی، ئەوکەسەش کە سەجدەی نەبردووە گوناحی ناگاتێ.

**شوێنەکانی کڕنووش (سجدة):**

**عن عمرو بن العاص: أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أقرأهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سجدةً في القرآن، منها ثلاثٌ في المفصّل وفي الحج سجدتان، رواه أبو داود وابن ماجه والحاكم والدارقطني وحسنه النووي والمنذري.**

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (١٥) پازدە ئایەتی سەجدەی لە قورئانی بەسەردا خوێندۆتەوە، لەوانە سێ لە سوورەتە کورتەکان و دوو سەجدەش لە سوورەتی حەجدا.

ئەم (١٥) پازدە شوێنەش ئەمانەن:

١- الأعراف / ٢٠٦
٢- الرعد / ١٥
٣- النحل / ٤٩
٤- الاسراء / ١٠٧
٥- مريم / ٥٨
٦- الحج / ١٨
٧- الحج / ٧٧
٨- الفرقان / ٦٠
٩- النمل / ٢٥
١٠- السجدة / ١٥
١١- ص / ٢٤
١٢- فصلت / ٣٧
١٣- النجم / ٦٢
١٤- الإنشقاق / ٢١
١٥- العلق / ١٩

جا ئێستا له قورئانەكاندا لەشوێنی سەجدەكەدا نیشانەیەكی بەم شێوە كراوە. ⬆

## چۆنیەتی بردنی سەجدەی قورئان خوێندن:

لەمەزهەبی شافیعیدا: ئەوەی بەمەرج دانراوە بۆ نوێژ مەرجیشن بۆ سەجدەی (تلاوە) وەك: دەست نوێژ، پاكی لاشەو شوێن و بەرگ، روو لە قیبلەكردن، داپۆشینی عەورەت، هاتنی كاتی سوجدەبردن، واتە مەرجە ئایەتەكەی سەجدەی بەتەواوی خوێندبێ یان بەتەواوی گوێی لێ بێ ئینجا سەجدە ببات.

وە لەمەزهەبی شافعیدادا هاتووە:

هەركەسێك لەدەرەوەی نوێژدا سەجدەی (تلاوە) ببات، واجبە نیەتی سوجدەی (تلاوە) بێنێ و وە واجبیشە (الله اكبر)ی سەجدەی دابەستن بلێ و سوننەتیشە هەردوو دەستەكانی بەرزبكاتەوە ئینجا (الله اكبر)ێكی تر دەڵێ بۆ چوونە سەجدە بێ دەست بەرز كردنەوە، تەنها یەك سەجدە دەبات وەكو سەجدەی نوێژ، ئەوجا هەڵدەستێتەوە لەگەڵ هەستانەوەكە (الله اكبر) دەڵێ و دادەنیشێ ئینجا سەلام دەداتەوە وەكو سەلام دانەوەی نوێژ كە ئەم سەلام دانەوەش واجبە، ئەمانەش هەمووی بەدانیشتن دەكات.

(ابن حزم) لە (المُحلّى)دا دەڵێ:

(ليس السجود فرضاً لكنه فضل، ويسجد لها في الصلاة الفريضة والتطوع، وفي غير الصلاة في كل وقت، وعند طلوع الشمس وغروبها واستوائها إلى القبلة وإلى غير القبلة، وعلى طهارة وعلى غير طهارة).

واتە: سەجدەی (تلاوة) فەرز نییە بەڵكو سوننەتە، وە ئەم سەجدەیە دەبردرێ لەناو نوێژی فەرزو سوننەت، وە هەروەها لەدەرەوەی نوێژیش وە لەهەموو كاتێكیشدا، لەكاتی رۆژهەلاتن لەكاتی ئاوابوونی رۆژ وە

لەکاتێ کە ڕۆژ لەناوەندی ئاسماندایە (استواء) بەرەو قیبلە بێ یا بەرەو قیبلە نەبێت، دەست نوێژی هەبێت یان نەبێت.

وە ئیمام (بخاری) ڕیوایەتی کردووە لە (ابن عمر) کە ئەم سەجدەیەی بەبێ دەستنوێژ بردووە.

(عبدالله)ی کوڕی مسعود دەڵێ: (اذا قرات سجدة فكبر واسجد، واذا رفعت راسك فكبر) واتە: ئەگەر ئایەتەکی سەجدەت خوێندەوە (الله اكبر) بڵێ ئینجا سەجدە ببە، وە ئەگەر سەرت بەرزکردەوە (الله اكبر) بڵێ.

## چی دەگوترێ لە سەجدەی قورئان خوێندن:

١- عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقولُ في سجود القرآن بالليل يقول في السجدة مراراً (سجد وجهي للذي خلقه وشق سمعه وبصرة بحوله وقوته) حديث صحيح رواه ابو داود والترمذي والنسائي.

واتە: عائشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشەو لەسەجدەی خوێندنی قورئان چەندجار دەیفەرموو (سجد وجهي للذي خلقه وشق سمعه وبصره وبحوله وقوته) واتە: ڕووم کڕنووشی برد، بۆ ئەو زاتەی کە دروستی کردووەو وێنەی کێشاوە، وە بەهێزو توانای خۆی بیستن و دیتنی تێدا پەیدا کردووە

٢- عن ابن عباس قال: كنت عند النبي (صلى الله عليه وسلم) فاتاه رجل فقال: إني رايت البارحة فيما يرى النائم، كأني اصلي إلى اصل شجرةٍ. فقرات السجدة فسجدتُ، فسجدت الشجرة لسجودي، فسمعتها تقول: الهم احطط عني بها وزراً، واكتب لي بها اجراً، واجعلها لي عندك ذخراً.

قال ابن عباس: فرايت النبي (صلى الله عليه وسلم) قرا السجدة فسجد فسمعته يقول في سجوده مثل الذي اخبره الرجل من قول الشجرة. حديث صحيح رواه الترمذي وابن ماجه.

واتە: ابن عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لەلای پێغەمبەر بووم (صلى الله عليه وسلم) پیاوێك هاتەلای گووتی: ئەم شەو لەخەوتمدا بینیم نوێژم دەكرد بەرەو ڕووی بنی دارێك ئایەتێكی سەجدەم خوێندو ئینجا سەجدەم برد، دارەكەش سەجدەی برد، گوێم لێ بوو دەیگووت (اللهم احطط عني بها وزرا، واكتب لي بها أجرا واجعلها لي عندك ذُخرا) واتە: خوایە بەهۆی ئەم سەجدەیەم گوناهم پێ لابیە، وە بەهۆیەوە پاداشتم بۆ بنووسە، وە لەلای خۆت بۆم بكە بە زەخیرە.

جا (ابن عباس) دەڵێ: پێغەمبەرم بینی (صلى الله عليه وسلم) ئایەتێكی سەجدەی خوێندەوەو سەجدەی برد گوێم لێ بوو لەسەجدەكەیدا ئەوەی دەگووت وەكو چۆن پیاوەكە خەبەری پێ دابوو لەقسەی دارەكە.

### ڕوونكردنەوەی زیاتر دەربارەی سەجدەی خوێندنی قورئان:

١- سەجدەی سوورەتی (ص) زۆربەی زانایان بەسەجدەی سوپاسگوزاری (سجدة الشكر)ی دادەنێن، ئەم سەجدەیەش لەنوێژو لەدەرەوەی نوێژ دروست (جائز)ە، لەلای شافیعییەكان تەنها سوننەتە لەدەرەوەی نوێژ ببرێ.

٢- ئەگەر قورئان خوێن چەندجار ئایەتی سەجدەی دووبارە كردەوە یان یەكێك چەندجار گوێی لەئایەتێكی سەجدەبوو دووبارە كرایەوە ئەوە یەك سەجدە دەبات لەكۆتاییەكەی، بەڵام ئەگەر لەدوای خوێندنی یەكەم سەجدەی برد ئەوە دیسان سەجدە دووبارە دەكاتەوە.

٣- (جمهور) لەسەر ئەوەن كە (مستحب)ە كڕنووش ببردرێ دوای خوێندنی ئایەتی سەجدە یا بیستنی، بەڵام ئەگەر سەجدەكەی زوو نەبرد ئەوە دەتوانێ سەجدەكە ببات بەمەرجێك نێوانەكە درێژ نەبووبێتەوە، بەڵام ئەگەر درێژ بووبێتەوە ئەوە سەجدەكە كاتی ئامێنێ و قەزاش ناكرێتەوە.

٤- دروست نییە هەتا ئایەتی سەجدەكە تەواو نەخوێندرێ سەجدەی (تلاوة) ببردرێ.

## (٢) خاڵ بۆ ئەوانەی قورئان لەبەردەکەن:

١- ئەوانەی کە دەیانەوێ قورئان لەبەربکەن با تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەم کارە بکەن، لەپێشەکیدا جوان لە مەبەستەکەیان ورد ببنەوە ئەگەر خڵتەیەك لە مەبەستەکەیاندا هەبوو یا پاکی بکەنەوە، چونکە لەوانەیە ئینسانی وا هەبێت لەنێوان چوار دیواری ماڵەکەیدا قورئان لەبەربکات، کەسی لێ دیار نەبێت، بەڵام ئەو بۆ ئەوەیەتی سبەینێ کارەکەی خەڵك پێی بزانن و پێی بڵێن فلانە کەس ئەوەندەو ئەوەندە قورئانەی لەبەرەو (حافظ القرآن)ە.

جا تۆش هەر لەسەرەتای قورئان لەبەرکردن بڕیار بدە ئەوەندە قورئانەی لەبەری دەکەی بەکەسی نەڵێی، چونکە بەڕاستی زیان و خەسارەتێکی یەکجار گەورەیە تۆ ماندووبوونی چەندین ساڵی ژیانت بەقوربانی مەبەستێکی خراپ بکەی.

٢- گوناح نەکردن و کارکردن بەقورئان و پاك بوونەوەی دڵ لە چڵکی تاوان کاریگەری گەلێ زۆریان هەیە لەسەر قورئان لەبەرکردن و قورئان خوێندن

دڵ کەچی بۆ فەرمانەکانی خوا دڵ بەهۆیەوە ئارام دەبێت و ڕووناك دەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی مێشك ساف و ئامادەبوونی بۆ شت لەبەرکردن، بەپێچەوانەی ئەو دڵەی کەتاریکە بەهۆی گوناهانەوە، خودا سزایان دەدات بە لێسەندنەوەی زانست و لەبیرکردنی.

عەلی کوڕی خەشرام بەوەکیع کوڕی جەڕراحی گووت: من پیاوێکی بیرتیژ نیم هیچم لەبەرنییە شتێکم فێر بکە بۆشت لەبەرکردن (فعلمني دواءً للحفظ) وەکیع گوتی (یا بنيّ والله ما جرّبت

دواءً للحفظ مثل ترك المعاصي) واته: ئەی ڕۆڵە سوێند بەخوا هیچ دەرمانێکم تاقی نەکردۆتەوە بۆ شت لەبەرکردن وەك وازهێنان لە گوناه.

(ضحاك) یەکێکە لەتابیعەکان فەرموویەتی: من شك نابەم و نازانم کەسێك قورئانی لەبەربێت دوایی لەبیری چوبێتەوە، تەنها بەهۆی گوناه کردنەوە نەبێ، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوا دەفەرمووێ ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾ (الشورى: ٣٠).

واتە: هەر سزاو موسیبەتێك و ناخۆشییەکتان تووش دێت، ئەوە بەهۆی کردەوەی خراپی خۆتانەوەیە، وە لەزۆر لە کردەوە بەدەکانیشتان دەبووریٔ.

ئینجا (ضحاك) فەرمووی: دەبێ چ بەلاو موصیبەتێك لە قورئان لەبیرچوونەوە گەورەتر بێت.

کاتێك ئیمام مالك ئەو زیرەکی و تێگەیشتن و بلیمەتیەی ئیمامی شافعی بینی پێی گووت: من ئەبینم خوای گەورە تیشك و ڕۆناکی خۆی خستۆتە ناو دڵتەوە تۆش بەتاریکی گوناه ئەو ڕووناکییە مەکوژێنەوە.

وەکاتێکیش ئیمام شافعی حیفظی وەك جاران نەمابوو چووە لای وەکیعی مامۆستای سکاڵای خۆی لەلاکرد و ئەویش وەڵامی دایەوە، جا ئیمام شافعی ئەمە بەشیعر باس دەکات و دەڵێ:

*شَكَوتُ إلى وَكيعٍ سوءَ حِفظي ... فأرشَدني إلى تَركِ المعاصي*

*وقالَ إعلَم بأنَّ العِلمَ نورٌ ... ونورُ اللهِ لا يُهدى للعاصي*

## بەچەند قورئان خەتم بکرێ؟

عنْ عبدالله بنِ عَمْرو، قال: انكحني ابي إمرأةً ذاتَ حَسَبٍ، فكانَ يتعاهَدُ كنَّتَهُ فَيسألُها عن بَعْلِها فتقولُ: نعم الرَّجُلُ منْ رجُلٍ لَمْ يَطأ لنا فراشاً ولَمْ يُفَتِّشْ لنا كنَفاً منذُ أتيناهُ، فلمَّا طالَ ذلك عليه ذكر للنبيِّ (صلى الله عليه وسلم) فقال: الْقَنِي به، فلقيتُهُ بَعْدُ فقال: كيفَ تصومُ؟ قالَ كلَّ يومٍ، قال: وكيفَ تختمُ؟ قالَ: كل ليلةٍ، قال: صُمْ في كُلِّ شهرٍ ثلاثة، و اقرَءِ القرآنَ في كُلِّ شهر، قال: قلتُ اطيقُ اكثر منْ ذلك، قال: صم ثلاثة ايامٍ في الجُمُعةِ، قلتُ: اطيق اكثر من ذلك، قالَ: صُمْ افضلَ الصَّوم صَوم داودَ: صيامَ يومٍ وإفطار يومٍ، واقرا في كُلِّ سَبْعِ ليالٍ مَرَّةً، فَلَيتني قبلت رخصةَ رسولِ الله (صلى الله عليه وسلم) وذاك اني كبرتُ وضَعُفْتُ يقرا على بعضِ اهله السُّبْعَ منَ القرآنِ بالنَّهارِ، والذي يقرؤُهُ يعرِضُهُ منَ النهار ليكونَ اخَفَّ عليه بالليل، واذا ارادَ ان يتقوى افطر اياماً واحصى وصام مثْلَهُنَّ كراهيَةَ انْ يَتْرُكَ شيئاً فارقَ النبيَّ (صلى الله عليه وسلم)، رواه البخاري (٥٠٥٢).

واتە: (عبدالله)ی کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: باوکم ژنێکی خانەدانی بۆم هێنا، ئاوە ئاوە سەری لە بووکەکەی دەدا، وە هەواڵی مێردەکەی لێ دەپرسی، ئەویش پێی دەڵێ: پیاو لەوە چاتر دەبێ چۆن بێ (لم يطأ لنا فراشاً ولم يفتش لنا كنفاً منذ اتيناه) ئەم ڕستەیەی ماناى ئەوەیە لەوەتەی هاتوومە لای سەرجێی لەگەڵدا نەکردووە، کە ئەم حاڵە درێژەی کێشا باوکم ئەمەی بە پێغەمبەر گووت (صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی بۆمی بهێنە، جا لەوەدوا چووم بۆلای فەرمووی: چۆن بەڕۆژوو دەبی؟ گوتم: هەموو ڕۆژێ، فەرمووی: چۆن خەتمی قورئان

دەکەی؟ گوتم: هەموو شەوێ، فەرمووی: لەهەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، وە هەموو مانگێکیش یەك خەتم بکە، دەڵێ گوتم: من لەمە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: لە هەفتەی سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، گوتم: لەمە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبەو یەك ڕۆژ پێ بە، دەڵێ گوتم: لەمە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: باشترین بەڕۆژووبوون بەڕۆژبە ڕۆژووگرتنی داود، بەڕۆژووبوونی ڕۆژێك و بەڕۆژونەبوونی ڕۆژێك (واتە ڕۆژێك نا ڕۆژێك) وە لەهەر حەوت شەوێکیشدا یەك جار قورئان خەتم بکە.

جا (عبدالله) دەڵێ: خۆزیا مۆڵەتەکەی پێغەمبەری خوام قەبووڵ بکردایە، چونکە ئێستا تەمەنم گەورە بووەو بێ هێز بوویمە.

لەدوایی‌دا دەچوو ئەو حەوت یەکەی کەبەشەو دەیخوێند لە قورئان بەڕۆژ لای یەکێ لەکەس و کارەکەی خۆی دەوری دەکردەوە هەتا بە باشی ڕەوانی بێ، هەتا شەو بەئاسانی بیخوێنێ.

وە کاتێك بیویستبا بەهێز بووایە چەند ڕۆژێك بەڕۆژوو نەدەبوو ڕۆژووەکانی دەژمارد لەدوایی‌دا ڕۆژووەکانی دەگرتنەوە، لەبەرئەوە پێی ناخۆش بوو کە ئەو شتەی لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردبوونی وازی لێ بێنێ.

وعن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) أن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال: (لم يفقه من قرأ القرآن في أقلّ منْ ثلاث).

واتە: (تێ ناگات ئەوکەسەی کە قورئان لەسێ ڕۆژان کەمتر دەخوێنێتەوە).

عن عبدالله بن عمرو أن النبيّ (ﷺ) قال لهُ (اقرأ القرآن في اربعين) حديث صحيح رواه الترمذي (٢٩٤٧) وابو داود (١٣٩٥).

واتە: عبدالله کوڕی عمرو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووە کەلەماوەی (٤٠) ڕۆژ قورئان خەتم بکات، ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەڵێ: (لانحبُ للرّجلُ أن يأتي عليه اكثر من اربعين يوماً ، ولم يقرأ القرآن لهذا الحديث).

واتە: پێمان خۆش نییە پیاو چل ڕۆژی زیاتر بەسەردا بڕوات و قورئان ختم ناکات لەبەر ئەم فەرموودەیە.

ئیمام نووی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ:

(ينبغي ان يحافظ على تلاوته ليلا ونهاراً، سفراً وحضرا).

وە دەفەرمووێ: پێشینەکان هەریەکەو لەماوەی جیا قورئانیان خەتم دەکرد کۆمەڵێك بەدوو مانگ جارێك قورئانیان خەتم دەکرد، هەندێکی تر لەماوەی مانگێك خەتمایان دەکرد، وە هەندێکی تر لەماوەی حەفتەیەکدا قورئانیان خەتم دەکرد، کە ئەوە کاری زۆربەیان بوو، لەپێشینەکان (سلف).

هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەگەر قورئان کەمیش بخوێنرێتەوە بەڵام لەسەرخۆو بەبیرلێکردنەوە بخوێنرێتەوە باشترە لەوەی زۆر بخوێنرێتەوە، بەڵام بەپەلە بخوێنرێتەوە، ئەمەش ڕێگای (ابن عباس) و (ابن مسعود) و جگە لەمانیشە.

یەکێك لەپێشینەکان فەرموویەتی (قال بعض السلف): (نزل القرآن ليُعمل به فاتخذوا تلاوته عملا) واتە: قورئان دابەزیووە بۆئەوەی کاری پێ بکرێ بەڵام ئەوان خوێندنەوەکەیان بەکارپێکردن وەرگرتووە.

لە (مجاهد)یان پرسی دەربارەی دوو پیاو یەکێکیان لەناو نوێژ تەنها سورەتی (بقرة) بخوێنێ، ئەوەی تریان (بقرة) و (آل عمران) بخوێنێ، بەڵام سوجدەو ڕکوعیان وەکو یەك بێت، نوێژەکە لەیەك کات تەواوبکەن، فەرمووی: ئەوەی تەنها سورەتی (بقرة) دەخوێنێ باشترە.

(بخاري) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە: کە (ابو حمزة) بە (ابن عباس)ی گوت من کەسێکم بەپەلە قورئان دەخوێنم وە جاری وا بووە لەشەوێکدا هەموو قورئانم خوێندووە (وربما قرات القرآن كله مرة في الليلة) (ابن عباس) فەرمووی: ئەگەر یەك سوورەت بخوێنم لەسەر خۆو بیری لێ بکەمەوە لام خۆشەویسترە لەوەی کەتۆ دەیکەی، بەڵام ئەگەر هەر بەپەلەش دەیخوێنی (فاقرا قراءة تسمعها اذنك ويعيها قلبك) بەشێوەیەك بیخوێنە کە بیبیستی و دڵت لێی تێ بگات.

# قــورئـــان

١- قورئان (١١٤) سورەتە و (٦٠) حزبەو (٢٤٠) ربعە.

٢- ژمارەی ئایەتەکانی (٦٢٣٦) ئایەتە.

٣- ژمارەی وشەکانی (٧٧٩٣٤) وشەیە بەلای هەندێ لەزانایانەوە.

٤- ژمارەی پیتەکانی (٣٢٣٦٧١) پیتە.

٥- قورئان (٣٠) جوزئە.

٦- قورئان بەماوەی (٢٢) ساڵ و (٢) مانگ و (١٢) رۆژ دابەزیوە، ماوەی سەردەمی مەککی (١٢) ساڵ و (٥) مانگ و (٣) رۆژە، وە ماوەی سەردەمی مەدەنی (٩) ساڵ و (٩) مانگ و (٩) رۆژە.

٧- لە (١١٤) سورەتەکانی قورئان (٢٣) سورەتیان مەدەنییە کە بریتین لە سورەتە درێژەکان، نزیکەی (١١/٣٠)ی قورئانن وە (٩١) سورەتیان مەککین کە نزیکەی (١٩/٣٠) قورئانن.

٨- یەکەم ئایەت لەقورئان دابەزیوە ئایەتی (١) لەسورەتی (علق) بووە (إقرا باسم ربك الذي خلق) لە ئەشکەوتی (حراء).

وە کۆتا ئایەت کە لەقورئاندا دابەزیووە ئایەتی (٢٨١) لە سوورەتی (بقرة)یە ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ﴾.

٩- درێژترین سورەت لە قورئاندا سورەتی (البقرة)یە.

١٠- کورتترین سورەت لەقورئاندا سورەتی (کَوثَر)ە.

١١- درێژترین ئایەت لەقورئاندا ئایەتی قەرزە (الدَّين) لەسورەتی (البقرة)دا ئایەتی ژمارە (٢٨٢) وە کورتترین ئایەت لە قورئاندا جگە لە پیتەکان ئایەتی (ثُمَّ نَظَر) لەسورەتی (مُدَّثِر) ئایەتی (٢٠).

١٢- گەورەترین ئایەت لەقورئاندا (آية الكرسي)یە.

١٣- درێژترین وشە لە قورئاندا وشەی (فَأَسقَيناكُموه) لە سورەتی (الحجر)ە ئایەتی (٢٢).

١٤- سورەتێك کە هەموو ئایەتەکانی وشەی (الله)ی تێدا هاتبێت سورەتی (مجادلة)یە.

# بابەتی پەیوەندیدار بە قورئان

١- ئیمام (نووی) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: (اعلم أن تلاوة القرآن هي افضل الأذكار) واتە: بزانە خوێندنی قورئان گەورەترین (ذکر)ە، وە دەفەرمووێ: باشترین کات و شوێن بۆ قورئان خوێندن لەناو نوێژە، بەڵام لەغەیری نوێژ لەکاتی شەوە، لەنیوەی شەوی ئاخیری باشترە لەنیوەی شەوی یەکەم، وە باشترین قورئان خوێندن لەرۆژدا لەدوای نوێژی بەیانییە.

٢-وەستان لەسەری ئایەت سوننەتە:

عن امّ سلمةَ (رضي الله عنها) قالت: انَّ النبيَّ (صلى الله عليه وسلم) كان اذا قرا قطع قراءتهُ آيةً آية، يقول (بسم الله الرحمن الرحيم) ثم يقف، ثم يقولُ (الحمد لله رب العالمين) ثُمّ يقف، ثم يقولُ (الرحمن الرحيم) ثمّ يقف، ثمّ يقولُ (مالك يوم الدّين) ثم يقف. رواه ابو داود والترمذي(٢٩٢٧) واحمد وغيرهم وصححه الالباني.

واتە:

(أم سلمه) (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کاتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی بخوێندبا ئایەت ئایەت دەیخوێند، دەیفەرموو: (بسم الله الرحمن الرحيم) لەپاشان دەوەستا، لەپاشان دەیفەرموو: (الحمد لله رب العالمين) لەپاشان دەوەستا، لەپاشان دەیفەرموو: (الرحمن الرحيم) لەپاشان دەوەستا، لەپاشان دەیفەرموو: (مالك يوم الدين) لەپاشان دەوەستا.

٣- سوننەتە بەدەنگی خۆش قورئان بخوێنرێ:

عن البراء بن عازب، انَّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: زَيِّنُوا

القرآن بأصواتكم فانَّ الصوت الحسن يزيد القرآن حُسناً)[1] واته: قورئان برازێننەوە بەدەنگەکانتان، بێگومان دەنگی خۆش زیاتر جوانی دەبەخشێت بە قورئان، وە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:
(من لم يتغنَّ بالقرآن فليس منّا)[2]
واته: هەریەکێك بەدەنگی خۆش قورئان نەخوێنێتەوە لەئێمە نییە

٤- (قد اجمع العلماء سلفاً وخلفاً على ان ترتيب الآيات امر توقيفيٌ ليس من صنع البشر، بل هو متلقى من رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عن جبريل عن ربّ العزة جل جلاله، وكذلك ترتيب السور، فانّ جماهير العلماء من السلف والخلف اجمعوا على انه توقيفي كترتيب الآيات).
کەواتە ریزکردنی ئایەتەکانی قورئان یەك لەدوای یەك وە هەروەها ریزکردنی سوورەتەکانیش کە بەم شێوەی ئێستا لە قورئانەکان دەیان بینین، دەستی بەشەری تێدا نییەو هەمووی بەفەرمانی خوایە

٥- ئەو قورئانانەی کە ئیمام عثمان فەرمانی کرد بنوسرێنەوە بەبێ خاڵ (نقطة) و ژێرو بۆرو سەرو تەنوین بوون، بەڵکو ئەمانە لەدواییدا کران دیارترین ئەو کەسانەی کە شێوازو نوقتەی قورئانیان داناوە ابو الأسود الدؤلي و یەحیای کوڕی یعمر و نصری کوڕی عاصمی لیثي بوون، ئەم سێیانە دەورێکی بنەڕەتیان هەبووە بۆ ئەم کارە پیرۆزە، وە ئەم کارەش هەر لەخۆوە نەکراوە بەڵکو بەهۆی سەرجەم قاريء و (حافظ)ەکانی قورئانەوە ئەم کارە ئەنجام دراوە وە بەفەرمانی (عبدالملك)ی کوڕی مەڕوان بووە کە فەرمانی بەحەججاجی کوڕی یوسفی (ثقف)ي کردووە بەدانانی ئەو دەستەیە بۆ ئەم کارە

---

(١) رواه ابو داود وسنده صحيح.
(٢) رواه احمد وابو داود وابن ماجه والحاكم وصححه الالباني في صحيح الجامع (٣٥٨٠).

٦- ئەمڕۆ لەجیهاندا چوار نوسخە لە نوسخەکانی دەستنووسی قورئانی پیرۆز هەیە، لەو نوسخانەی کە ئیمامی عثمان فەرمانی بە نووسینەوەیان کردبوو: یەکەم نوسخە لەشاری قاهیرەیە لە مصر، دووەم و سێیەم لەشاری (استانبۆل)ە لەتورکیا، چوارەم نوسخە لەشاری کاشقەند لە روسیادا بەشێوەی نووسینی کوفی نووسراوە.

٧- تۆیش ئەگەر خوای گەورە نیعمەتی ئەوەی لەگەڵدا کردووی فێری قورئانی کردووی، هەوڵ بدە فێری تەفسیرەکەشی ببی، ئەگەر عەرەبیش نەزانی ئێستا سوپاس بۆ خوا تەفسیری کوردی زۆر هەن، یەکێك لەو تەفسیرە باشانە (پوختەی تەفسیری قورئان)ە کە مامۆستا مەلا محمد صالح بامۆکی دایناوە، بۆ ئەم مەبەستە دەتوانی سوودی زۆری لێ وەربگری رێگات بۆ ئاسان دەکات بۆ تەفسیرێکی فراوانتر.
وە تەفسیری عەرەبیش زۆرن لەوانە تەفسیری (طبري) کە تەفسیرێکی ئاسان و زۆر بەسوودە ئێستا لەبازارەکان لەشێوەی (١٥) بەرگدا هەیە و دەست دەکەوێت.

ابن مسعود (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: (كان الرجلُ منّا اذا تعلم آيات لم يتجاوزهنّ حتى يعرف معانيهنّ والعمل بهنّ)[1] واتە: هەرپیاوێك لەئێمە دە ئایەتی لەقورئانی لەبەرکردایە بەسەریدا تێنەدەپەڕی تاوەکو مانای نەزانیبایەو کاری پێنەکردبایە.

(١) رواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

# ناوەڕۆك